

کەریمی حیسامی

# لە بیرەوەریەکانم

## ١٩٥٧ - ١٩٦٥

بەرگی دووەم

ستۆکهۆڵم ١٩٨٧

بەرگی دووهەمی بیرەوەریەکانم ٠

بەسەرهاتەکانی دوای ئازادیم لە زیندان و

دەربەدەری لە نیشتمان

١٩٥٧ ـ ١٩٦٥

"حیسامی"

بەرگی دووەمی بیرەوەریەکانم :

بەسەرهاتەکانی دوای ئازادیم لە زیندان و دووری لە نیشتمان ۰

١٩٥٧ - ١٩٦٥

پڕ بە دڵ سوپاسی کاک ناسری ئیبراهیمی دەکەم کە ئەرکی ماشین‌کردن و ئامادەکردنی گرتە ئە سێۆ و برایانەش ئەنجامیدا ۰

کەریمی حسامی
ئوکتوبری ١٩٨٧

## " پێشەکی "

بە تەما نەبووم بۆ بەرگی دووهەمی بیرەوەریەکانم پێشەکی بنووسم . بەڵام لەگەڵ بڵاو بوونەوەی بەرگی یەکەم و پێشوازی هاونیشتمانانی بەڕێز گەلێك نامە و راسپاردەو بیرو رای جیاواز لە سەر نێوەرۆکی بەرگی یەکەمی بیرەوەریەکانم دەگەیشتنە دەستم. لە دەستخۆشانەوە بگرە تا رەخنەو لێکۆڵینەوەی نووسراوەکان و باسی ئەدەبی و ... هتد.

بە گشتی ئەگەر تەواوی نامەو راسپاردەو تەلیفون و بیرو رای خوێنەران لە سەر چۆنیەتی بەرگی یەکەم بێتە بەراورد کردن و هەڵسەنگاندن ، لام وایە پارسەنگی تای تەرازوو بەلای پەسەند کردن و دەستخۆشانەدا قورس تر دەبێ . لەم کورتە پێشەکیەدا لە گەڵ سپاس بۆ خوێنەران و ئەو برادەرانەی دەستخۆشانەیان لی کردووم ئەو بەشە وەلا دەنێم و باسی بەشی رەخنەو بیرو رای رەخنەگەران دەکەم .

رەخنەکان لە سەر یەك بەم جۆرەن:

١- زۆر کەس لەو باوەڕەدا بوون کە فرە باسی خۆم کراوە.

٢- هێندێك گوتویانە باشی رابواردوەو دڵداری کردوە.

٣- هێندی لایان وابوە کە باری ئەدەبی نووسینەکان لاوازەو بە زمانی سادە نووسراوە. واتە نووسەر هەوڵی نەداوە مێشکی خۆی رێك بگوشێ و وشەو رستەی داتاشراو و ناقۆڵا بە نێوی ئەدەبی بدۆزیتەوەو خەڵکیان پێوە ماندووبکا.

٤ - هەبوون رەخنەیان ئەوە بوە کە تەنیا بە سەرهاتەکان نووسراون، بابەت و

رووداوەکان شی نەکراونەوەو لێ یان نەکۆڵدراوەتەوە.
بۆ روون کردنەوەی ئەو برا رەخنەگرانەو خوێنەرانی بەرێز بە پێویستم زانی ئەم مەبەستانە روون کەمەوە.
١- من چیرۆك و رۆمانم نەنووسیوە کە بە خەیاڵ پاڵەوان درووست بکەم.ژیان و بەسەرهاتی خۆم نووسیوەو دەبوایە هەر باسی خۆم بکەم و ژیانی خۆم بێنمە سەر کاغەز.
٢- باسی دڵداری سەردەمی هەرزەکاری کە پتر سرنجی زۆر کەسی راکێشاوە، لە دەست پێکردنەوە بەڵێنیم دابوو کە شتی بە درۆ نەنووسم. جا ئەگەر لە بیرەوەریەکانم دا خۆم کردبا بە مەلائیکەتی سەر زەوی و وام نیشان دابا کە دەستم وەدەستی نامەحرەم نەکەوتوەو دەستنوێژم لە کەس نەشکاوەو بە درۆ ئاوێکی پاك و خاوێنم بە خۆم و بە کۆمەڵی کوردەواریدا کردبایە، دیاربوو درۆم دەکرد. ئەو دەم لە بەشی سیاسی و خەبات و تێکۆشانیشەوە دەبوایە درۆ بکەم.
لام وایە ئەوەی من نووسیومە زۆر یا کەم لە سەر دەمێکی دیاری کراوی تەمەنی هەموو ئادەمیزادێك دا دێتە پێش و رووداوێکی ئاسایی یە. کۆمەڵی کوردە- واریش وەك هەموو کۆمەڵی ئادەمیزاد کیژو کورو ژن و پیاوی تێدا دەژی لە یاسای سروشت بەدەر نیە. لە ژیان دا ئاڵو گۆڕ هەیە. وەك دەبینن لە بەرگی دووهەم دا بووم بە شێخی تەریقەت و مریشکی کەسم لە ئاو نەکردوە!
٣- من وا راهاتووم سادەو رەوان بە زمانی خەڵك بنووسم. خۆم ماندوو ناکەم لە وشەی قەڵەو و داتاشراو بگەڕێم. چیم بە مێشك و نووکی خامەدا بێ دەینووسم و نووسیومە. بێجگە لەوە پەخشانی ئەدەبیم نەنووسیوە، بەسەرهاتی خۆم چۆن بوە ئاوا پێدا هاتوم.
٤- تەهاتوم لە رووداوەکان بکۆڵمەوەو نێوەرۆکیان هەڵسەنگێنم و بە سەرهاتەکان شی بکەمەوە. ئەو رووداوانەم نووسیون کە راستەو خۆ پێوەندیان بە ژیانی خۆمەوە هەبوە. هیچ نەبێ کەرەسەیەکن بۆ ئەو کەسانەی کە بیانەوێ لە دوارۆژدا لە روداوەکانی کوردستان بکۆڵنەوە.

لە گەڵ سپاس بۆ ئەو کەسانەی رەخنەیان گرتوەو دەستخۆشیان پێ گوتوەو لە ئامادە کردنی یارمەتیان داوم ، ئەوە بەرگی دووهەمی بیرەوەریەکانم دەخەمە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێزی کوردو بە هیوای بڵاو بوونەوەی بەرگی سێ و چوارو پێنج کە گەلێك روداو و بەسەرهات و خەبات و تیکوشانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران روون دەکەمەوە.

" کەریمی حیسامی "

## " هاتنــــــه دەر لــــــه زینـــــــــــدان "

رۆژی١٦ ی جۆزەردانی ١٣٣٦ ـ شەشی ژوئنی سالّی ١٩٥٧ پسولـــــــــەی ئازادیم له زیندان هاتبوه دەفتەری زینداتی مەهاباد ٠ پۆلیس بانگی کردم که له زیندان وەدەر کەوم ٠ له گەڵ گیراوەکان یەك یەك ما لاوایيم کرد٠ هێنـــــدێ شتوو مەکی زیادیم له لا بوو ، دام بە چەند کەسی نەدارو فەقیری گیراو ٠
دەرگایزیندانم لێ کراوەو هاتمە دەرێ، له نێو چوار دیوارێکی زیندانەوەهاتمە زیندانێکی بەر فرەوان و ئاواڵه که وڵاتەکەم بوو ٠ که هاتمە دەفتەری زینـــدان میرزا جەلیلی باوکی یوسفی ریزوانی لەوێ راوەستابوو چاوەڕوانی منی دەکرد پێ خەف و جلەکانی بەئەمبالێکی هەڵگرت بۆ ماڵی خۆیان ٠ من هیـــــــــچ چاوەڕوانی ئەوه نەبووم ٠ بەڵام دیار بوو یوسف له زیندانی تەورێزەوە بۆباوکی نووسیبوو که بێته زیندان و من بەرێته ماڵی خۆیان٠له رادە بەدەر بە خێراتـن یان کردم ٠ میرزا جەلیل دایکی یوسفی تەڵاق دابوو، یا بڵێین دەری کردبـــــوو کۆنه ژنی حەمەڕەسو سەر سووری مارە کردبۆوە ٠ ژنێکی له چاو میرزا جەلیـــل جحێڵ ، ژنێکی جوان و پاك و خاوێن٠ له حەمەڕەسو سەر سوور جیا ببـــۆوە و مێردی بە میرزا جەلیل کردبوو٠ له لایەك ببۆوە هۆی تێك دانی وەزعی ژیانـــی دایکی چەند منداڵان و له لایەکی دیکەش له گەڵ میرزا جەلیل تەمەنیان یەکـــی نەدەگرتەوە ٠

رۆژێك پاش ئازاد بوونم چومه خزمەت حاجی مەلا خالیدی وەحیدی ئـــــەو کەـەی که له زیندانی مەهاباد دەهاته لام و سەری دەدام ٠ له بارەی ژیـــان و تێکوشانی سیاسی دوارۆژ قسەمان کرد ٠ پاشان چومه ماڵی پێشــــــــەوا

قازی محەمەد ، مینا خانم بە جلی رەشەوە لە حەسار دانیشتبوو زۆر بە ویشکی بە خێر هاتنی کردم، نێزیکەی نیو ساعات لە لای بووم پاشان هەستام و مەدەر کەوتم . رۆژی دوایی چوومە مالّی خانمە خانم . سەبارەت بە شەخسیەتی ئەو شێرە ژنە و بە پاسی رێزیکی لەو ماوەیەدا کە لە مالّیان بووم لە منی گرتبوو ، بە پێویستم زانی بچم و سڵاوێکی لێ بکەم . تاوێك پێ چوو حەسەنی کوڕی هاتە لام و بەخێرهاتنی کردم . خانمە خانم نەهات . من ماوەیەکی زور لە هەل و مەرجی نەهێنی دا لە مالّی خانمە خانم ژیابووم . هەمیشە لە سەر سفرەیەك پێکەوە نانمان خواردبوو . بێجگە لە پێوەندی حیزبایەتی رێزو قەدرێکی تایبەتی خوشك و برایانە بۆ یەکتر قایل بووبین . بەڕاستی پێم وا نەبو کە خانمە خانم نەیە و بەخێرهاتنم نەکا . دیار بوو وەزع گۆڕابوو. نێزیکەی سەعاتێك دانیشتم و پاشان هەستام خوداحافیزیم لە حەسەنی کوڕی کردوئیتر قەت نەچوومەوە مالّیان .

چەند رۆژێك لە مالّ میرزا جەلیل بووم سەرەڕای رێزو حورمەتی زۆرتەماشام کرد مانەوەم لەوێ کارێکی حوان نیە . ژنێکی قیت و قۆز و بە قسە ، بوونی من لەوێ ئیتر مەسڵەحەت نەبوو . هەرچەندە میرزا جەلیل زیاتر لە باوکم بۆ من جێگای رێزو ئیحترام بوو .

پاش چەند رۆژ مانەوە لە مەهاباد، هاتنی برادەران بۆ لام، چوومە گوندی دورگە لای دایکم کە لە مالّی خوشکێکم دەژیا پاش سێ سالّ دوری جارێکی تریش لە گەلّ دایکم و دووخوشکم لێکتر کۆ بوینەوە بەلّام لە مالّی زاوا .دوسێ رۆژ لەوێ بوم پاشان چوومە نەغەدە مالّی کاك ئەحمەدی ئاهەنگەری . بێجگە لە رابوردوی تێکۆشانی سیاسی و حیزبایەتی، لە گەلّ کاك ئەحمەد دۆست و برادەرێکی گیانی بوین . کەم کەس هەبوە لە دوستایەتی دا ئەوەندە پێکەوە یەك بن . ئەو برادەرانەی نەغەدە کە لە پێشدا لە گەلّ من تێکۆشانی سیاسی - یان هەبوو ، دەهاتنە لام و لە وەزعی تێکوشان گلەیی یان دەکرد و هیواداریان دەر دەبڕی کە بە هاتنە دەری من لە زیندان وەزعی تێکۆشانیش گۆڕانی بەسەر دا بێت . لە مالّی کاك ئەحمەدی ئاهەنگەری چاوم بە خەجیجی کیژی

کاك ئەحمەد کەوت کە دایکم پێشتر بۆی باس کردبووم و تەنانەت هێشتا لە زیندانی ورمێ بوم کە دایکم قسەی لە گەڵ کردبوو کە بێمە دەرێ شوم پێ بکا . هەر لەوێ بڕیارم دا ئەگەر قەرار بێ ژن بێنم لەو کیژە باشتر بۆ من دەس نا دا، بە تایبەت کە دایکم زۆری خۆش دەویست . چەند رۆژێك لە نەغەدە بووم ،دوست و برادەری گوندەکانی سندوس و شنۆ دەهاتنە لام و بۆ تێکوشان هانم دەدان . بڕیارم دا سەفەرێکی ورمێ و تەورێز بکەم ، سەر لەو هاورێیانە بدەم کە لە گەڵم لە زیندان دا بوون و مەحکوم کرابوون . دو رۆژ لە ورمێ مامەوە کاتێك ویستم بۆ تەورێز بچم هەمزە ئەصل داشچی کە هاورێ یەکی ئازەربایجانی بوو دو ساڵ پێکەوە لە زیندان بووین هێندێك پارەی بۆ هێنام ، گوتی برادەران بۆیان ناردوی . بۆم دەرکەوت کە لە ئازەربایجان تێکۆشانی سیاسی دوبارە گەرای ناوەتەوە . لە تەورێز چوومە زیندانی شارەبانی بۆ سەردانی یوسفی ریزوانی . پۆلیس بانگی کرد دانیشتین باسی وەزعی زیندانی کرد زۆر ناڕازی بوو . باسی ناکۆکی و کێشەی نێو خۆی گیراوە سیاسیەکانی دەکرد .دوبەرەکی و ناکۆکی نێوان رێبەرانی حیزبی تودە گەیشتبوە نێو زیندانەکان و تەنانەت رێکخراوەکانی حیزبیشی گرتبۆوە .

ئەم وەزعەی بۆ حیزبی تودە هاتبووە پێش، حیزبی دیموکراتیشی گرتبۆوە عبدوالرحمانی قاسملۆ کە کادرێکی حیزبی تودە بووە وە پێشتر لە لایەن حیزبی تودەوە بۆ هاوکاری لە گەڵ کۆمیتەی رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان هاتبووە مەهاباد ، پاش ئەوە کە دەگەرێتەوە تاران ساڵی ۱۹۵۵ لە تاران دەگیرێ. پاش چەند رۆژ مانەوە لە زیندان مەعلوم نەبوو چون ئازاد دەکرێ . پاش ئازاد بوونی لە گەڵ رەحمەتی شەریعەتی و سەید عەولای ئیسحاقی و غەنی بلوریان و عەزیزی یوسفی بڕیار دەدەن کە هەموو پێوەندیەك لە گەڵ حیزبی تودە بپچڕێنن و بە ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستان وەك تەشکیلاتی سەر بەخۆ کار بکەن، بەلاّم بەرنامەیەك و رێنوێنیکی کاری تەشکیلاتی و تەبلیغاتی لە گۆڕی دا نەبوو . قاسملۆ ئەوەی بۆیە ساز کردبوو کە بە نێوی حیزبی دیموکرات بتوانێ لە ئێران وەدەر کەوێ، دەنا هەر وەك

ئەندامی حیزبی تودە مابوّوە • پاش ئەوە کە قاسملوّ لە زیندان دێتـــە دە ر پێشنیار دەکا لە گەلّ عەولای ئیسحاقی بچنە ئوّرووپا لە گەلّ ڕێبەرانی حیزبی تودە وتوو وێژ بکەن• ڕەحمانی قاسملوّ لە گەلّ عەولای ئیسحاقی دێنە عێراق و بە هوّی برایانی پارتی دەچنە ئوّرووپا • کاک عەزیزی یوسفی وەک بەر پرســـی حیزبی دیموکرات لە ئێران دەمێنیتەوە• ئەو کاتە غەنی بلوریانیش لە زیندان دا دەبێ• ڕوّژی ئاخری مانەوەم لە تەورێز چوومەوە لای یوسفی ریزوانی •توّپە گوڵێکی زوّر جوان و نایابی لە هەویری نانی بوّ دروست کردبووم و بە دیاری بوّی هێنام کە هەتا ماڵم مابوو وەک دیاریەکی بەنرخ پارێزرابوو •

کاتێک لە تەورێز گەرامەوە دەبوایە بیرێک لە وەزعی ژیان و بەڕێ چـــوون بکەم• دایکم لەم دەربەدەرییە نەجات بدەم و لە گەڵی بژیم • لە مەهاباد لـــە ماڵی سوّفی ساڵحی سەلیمی ژورێکم بە ئیجارە گرت، دایکم و کچێکی خوشکـــم کە هەر بە منداڵی ئێمە بە خێومان کردبوو هێنا مدە مەهاباد و حارێکی تر وەک ماڵ لە خانویەک دا کوّ بوینەوە دو مەسەلە هەمیشە بیری منیان بە خـــوّوە خەریک کردبوو،یەکیان مەسەلەی ژیان و بەڕێ چوون کە هیچم نەبوو • دوهـــەم مەسەلەی زیندو کردنەوەی پێوەندی لە گەڵ ئەندامانی حیزب و بوژانـــەوەی تێکوّشانی سیاسی •

ڕوّژێک لە مەهاباد کاک ڕەزاقی قازی ئاغای قزڵجەی سەرێ کە ماوەیـــەک پێکەوە لە زیندان بووین، ئەسپێکی بوّ ناردبووم و بانگی کردبووم کە چەند ڕوّژ بچمە گوندی و میوانی بم • لە گەڵ ئەو پیاوەی ناردبوی سوار بووم و چوومـــە قزڵجە • دو سێ ڕوّژ میوانی کاک ڕەزاق بووم • زوّر خوّشمان ڕابوارد • سەعاتـــم نەبوو کاک ڕەزاق سەعاتی دەستی خوّی بە دیاری دامێ کە تا بیست ساڵێـــش وەک یادگاری دوّستێکی خوّشەویست ڕام گرتبوو•

پاش هاتنەوەم لە قزڵجە ، سەرهەنگ سالاری زادە سەروّکی روکنی دوی سپای مەهاباد بانگی کردم و گوتی :

ــ بوّ چوو بوویە قزڵجە ، لە چی دەگەڕای؟

ــ قزڵجە ئێرانەو منیش ئێرانیم • ئاغای قزڵجە لە گەڵ من لە زیندان بووە

دوستایەتیمان پەیدا کردووەو بانگێشتنی کردوم و منیش چووم میوانی بووم.
بێدەنگ بوو ، پاشان گوتی :
ــ ئاگات لە خۆ بێ ، ئاگامان لە هەڵسوڕانی تۆ هەیە !
بیرم کردەوە سەرێکی عێراق بدەم ، بزانم ئەگەر بۆم بلوێ ، لە جێگایەك بحەوێمەوەو کارێك پەیدا بکەم بە یەکجاری بچمە کوردستانی عێراق و ئێران بەحێ بێڵم . پێشتر هات و چۆی زینوێ شێخیم کردبوو ، دۆست و ناسیارو هاو- ڕێی زۆرم هەبوون، خەبەرم دا بە کاك قادری کوڕی کا خدری دیبوکری کەو لاخێکم بۆ بنێرێ میوانیان دەبم (لە بەرگی یەکەم دا باسی ماڵی کاخدری‌دیبوکری و کوڕەکانیم کردوە کە لە زیندان بوینە ئاشنا) . هەر ئەوێ ڕۆژێ ئەسپێکیان بۆ ناردم و سوار بووم چوومە گوندی دێبوکری . کاخدری دیبوکری پیاوێکی موسوڵمان قسە خۆش و نیشتمان پەروەر ، دنیا دیتو زۆر حەزی لە پیاوەتی بوو دەستی کرد بە باسی کوردایەتی و حیزبی دیموکرات و کۆماری کوردستان و ئاخرەکەی هەموو بیرو قسەکانی لە سەر ئەوە راوەستا گوتی :
ــ هەموو کەس کوردە . ئێوە سەرۆك عەشیرەتەکان بگرن تەواوی خەڵك لە گەڵتانە !
پاشان چوومە هەواری ماڵە کاخدری لە سەری مەیدان هەڵیان دابوو . دووشەو لە تاولێ مامەوە . لە توانام دا نیە باسی ئەو خزمەت و میوان داریە بکەم کە لەوێ تووشی بووم . پاش دوو ڕۆژ حەمەدی خاڵە کە یەکێك لەو کەسانە بوو لە زیندان ناسی بووم و وەك ئەندامێکی حیزبی لە زیندان هاتبوە دەر ،کوڕێکی تێگەیشتوو جوامێر بوو، ئەسپی بۆ زین کردم و بەرەو عێراق کەوتمە ڕێ . نیوەڕۆ لە گوندی گمنەدار، میوانی کاکە سەنی گمنەدار بوم. ئەو پیاوە سالی ٥٣ پاش روخانی حکومەتی مصدق کە دایك و بابم لە نەغەدە بوون زۆری یارمەتی دابوون و پیاوەتی کرد بوو، وەزیفەم بوو سەری بدەم و سپاسی بکەم بە دیتنم زۆر شاد بوو . زۆری پێ نەچوو دو ژاندارم پەیدا بون . یەکیان ئەو کەسە بوو کە لە سندوس لە سەر دەمی کۆمەڵەدا لێم دابوو سەرم شکاندبوو (لە بەرگی یەکەم دا باسی کراوە). دابەزین کە منیان لەوێ دی پێکەوە سرتەیەکیان کرد . ژاندارمی

دیکە پرسی : خەڵکی کوێی و بۆ کوێ دەچی ؟
گوتم : من فلان کەس حەقی ئەو پرسیارەت نیە ئێرە ئێرانە، من لە تۆ ناپرسم بۆ کوێ دەچی ؟

کابرا کە دیتی دەستی لە هیچ گیر نابێ گوتی : ئاجز مەیە هەر پرسیارم کرد .

لەوێوە چوومە گوندی جەڕان و لە گەڵ قاچاقچیان چوومە زینوێ و میوانی شێخ عبیداللا بووم من پێشتر هات و چۆی ماڵە شیخ عبیداللام کردبو لە گەڵ هەمووان دۆست و ئاشنا بووم شێخ عبیداللا پیاوێکی نیشتمانپەروەرو کوردێکی دڵسۆز بوو . بە سەدان کوردی لێ قەوماو لە گوندو لە ماڵەکەی ئەو حەوابوونەوە . مستەفای کوڕی سەردەمێك لە گەڵ حیزبی کۆمونیستی عێراق کاری کردبوو ، بەڵام پاش ئەوە کە گیرابوو ماوەیەکی کەم لە زینداندا مابۆوە ئیتر وازی هێنابوو ئاغایەتی دەکرد . زۆریش باسی کوردایەتی و سیاسەتی پێخۆش بوو . هەرچەندی شێخ عبیداللا کوردو نیشتمانپەروەر بوو خەلك ، ئەوەندەش لە مستەفای کوڕی ناڕازی بوون .

شێخ عبیداللا سەبارەت بە تێکۆشانی سیاسی لە رادە بەدەر رێزی لێ دەگرتم . زۆر جار دوای نوێژی نیوەڕو لە سەر ئاتان لە بن دارە گوێز بانگی خەڵکی دەکرد، باسی سیاسی ساز دەکرد و دەیویست لە سەر مەسەلەی کورد قسە بکەم. هەمیشە باسی بەشخوراوی کوردی دەکرد، بەڵام یەکجار زۆر قینی لە کومونیستەکان بوو . منیش بە راشکاوی دیفاعم لە کومونیستەکان دەکرد لە سەر ئەو مەسەلەیە هەمیشە دم بە دمە مان بوو ، بەڵام نێوانیشمان هەمیشە یەکجار خۆش بوو .

ماوەی حەوتویەك لە زینوێ شێخی بووم . تەماشام کرد ناتوانم لە نێو کۆمەڵی زینوێ دا بژیم بریارم دا بگەڕێمەوە . لە گەڕانەوەدا کاك عومەری کوڕی شێخ عبیدوللا رادیۆیەکی ئەندریای باشی بە دیاری دامێ،هاتمەوە مەهاباد، رۆژێك هاشمی حوسێن زادە هاتە لام و گوتی :

ــ دووکەس لە برادەرانی حیزبی ئەوانەی لە دەرەوە کاردەکەن دەیانەوێ چاویان پێت بکەوێ . قەرارە بێنە قاوەخانەی دێبوکری، ئەتۆش بچیە وێ لەوێ

چاویان پێت بکەوێ . قەرارە بێنە قاوەخانەی دێبوکری ئەتوش بچیە ئەوی یەکتر دەبینن • قولاپێکی بۆ هێنام و گوتی: بە بیانوی راوە ماسی لە شاری وەدەر کەوە، بچۆ قاوەخانە و لە سەر چۆمی خەریکی راوە ماسی بە • ئەگەر ئەوان هاتن ، قاوەچی هاورێی خۆمانە بانگت دەکا •

بەیانی قولاپم هەڵگرت و بە سەر چۆمی سابلاغ دا هەڵکشام و چوومە قاوەخانەکە • بە قاوەچیم گوت : دەچمە سەر چۆمی ، ئەگەر برادەر پەیدابوون وەرە خەبەرم بدەیە • هەتا لای ئێواری لە سەر چۆمی بووم ، کەس پەیدا نەبوو • لە هاتنی ئەوان ناهومێد بووم ، ئاخر جار قولاپم هاویشت ماسی‌یەك پێوە بوو بە کاوە خۆ سێ کیلۆ دەبوو • ماسیم هێنا دەرو بە شوڵکەوە کردو گەرامەوە بۆ شار • باش بوو ماسیەکە لە دیتنی برادەران خێری کەمتر نەبوو •

پاش دوو سێ رۆژ دیسان هاشمی حوسێن زادە پەیدا بوو گوتی : " ئەو رۆژە برادەران پێیان نەکراوە بێن • سبەینێ لە سەیداوا لە چادری حاجی سەید حەسەنی بابی گەورە چاوەروانت دەبن دەبێ هەر بچی کاریان هەیەو پێویستە تۆ ببینن• "

خەبەرم دا حەمەدی خاڵەی ئەسپی بۆ هێنام ، سوار بووم چوومە سەری مەیدانی ، لە تاوڵی ماڵی کاخدری بەربەسێلێکی مەنگوڕیم خوارد، دوای نان خواردن لە گەڵ حەمەدی خاڵە سواربووین بۆ شوێنی دیاری کراو •

ئەم دوو برادەرە کە بریار بوو بیان بینم بریتی بوون لە کاك هاشمی اقل الطلاب و سمایلی قاسملو • لە نێو توتنی برادەرێك دەبن بە ناوی ئەحمەد، کە چاویان بە ئێمە دەکەوێ هەرچەندە چاوەروانی من بون پێیان وا دەبێ بێگانەین، لە ترسان خۆیان لە بن شیشە توتن و گژو گیا دا دەشارنەوە ئەم جارەش نەم توانی چاوم پێیان بکەوێ •

## بێکاری و پەل و پا بۆ بەرێ چوون

لە بەر بێکاری سەرم لێ ئەستور ببوو ، نە پوڵم هەبوو کاسبی بکەم و نە کارێك هەبوو خۆمی پێوە خەریك بکەم و نانیشی لێ پەیدا بێ ۰ برایم دەروێش حەمەدی ئەندامێکی تێکۆشەری حیزب و دارتاشێکی باش بوو۰ لە گوندی (دارە لەك) دەربەگەکان دەریان کردبوو، هاتبو لە مەهاباد دوکانێکی دارتاشی دانابوو، چەند شاگردی گرتبون و کاری باش بوو۰ رۆژێك گوتی : "وەرە لە گەڵ من کار بکە وەك شاگردێك ،مانگێ نەوەد تمەنت دەدەمێ ۰ واتا رۆژی سێ تمەن ۰ عیلاجم نەبوو، دەبوایە بژیم و دایکیشم بە خێو کەم ۰ ئەوکەسەی نێزیکەی ۱۵ ساڵ لە پێناو دابین کردنی مافی زەحمەتکێشان خەباتی کردبوو ماوەی سێ ساڵ لە زیندان دا بە سەر بەرزی بەربەرەکانی کردبوو، دەبوایە لە مەهاباد رۆژانە بە سێ تمەن شاگردی بکا ۰ چوومە لای وەستا برایم۰ من دارتاشیم نەدەزانی کارم ئەوە بوو کاتێك تۆقی ئارەبەی سور دەکردەوە،دەبوایە لە مزگەوتی بازار بە دوو سەتڵ ئاوێ بکێشم و بە تەگەرەکانی دا بکەم تا سارد دەبنەوە ۰ هێندێك لە ئاغاکانی شارۆیران بە ئانقەست دەهاتن لەوێ رادەوەستان بۆ ئەوەی من لەوحاڵەدا ببینن ۰ بەڵام گوێم نەدەدایەو کارم دەکرد۰

رۆژێ بە سێ تمەن بەرێ چوون زەحمەت بوو ۰ بیرم لەوە کردەوە بەڵکو لە لای میرزا رەحیمی خەرازی لە کورە خانە بە سەر پاڵە یان نووسەر دایمەزرێم. لە لایەك لەوانە بوو مزەی رۆژانەم پتر بێ و لە لایەکی دیکەش لە شار و لە نێو خەڵك دور دەبووم و نەختێ بە ئاسودەتر دەژیام ۰ میرزا رەحیم لە گەڵ خانمە خانمی سەدری قازی لە کورە خانە ببوە شەریك۰ حەسەنی حیسامی لە کورە خانە نوێنەری خانمە خانمە بوو۰

بە حەسەنی حیسامیم گوت: لە گەڵ میرزا رەحیم قسە بکا و بەڵکو لە کورە خانە کارێکم بدەنێ۰ پاش چەند رۆژ حەسەن هات و گوتی : "زۆرم هەوڵ دا میرزا رەحیم قەبوڵی نەکرد، دەی گوت ئەو لە لای دەوڵەت تاوانبارە ئەگەر

بێتە ئێرە، کورەخانەکەم پەکی دەکەوێ "

ئەو میرزا رەحیمە لە سەرەتای زیندو کردنەوەی رێکخراوەکانی حیزبی دا یەکێك لەو کەسانە بوو کە کاری دەکرد و تەنانەت سندوقداری حیزبیش بوو. بەڵام ئەو کاتەی کە چولاتەوە لە پاشە کشە دا بوو تەنانەت منی بە نوسەرو یان سەرپاڵەش رانەدەگرت .

لە لای میرزا برایم درێژەم بە شاگردی دا ، باش بوو دەمتوانی نانی رۆژانە پەیدا بکەم . رۆژێك هاشمی حوسین زادە هات و گوتی : " دوو برادەرلە نەغەدەن ، دەیانەوی چاویان بە تۆ بکەوێ . سواری ماشین بوم و چوومە نەغەدە، لە ماڵە حەمەدی خانمی، یەکێك لە هاورێیانی قەدیم و تێکوشەری حیزبی دیموکرات ، چاوم بەو دوو هاورێیە کەوت کە هەمان هاشم و سمایلی قاسملو بوون . لە سەر رێبازو بەرنامەو شێوەی کارو تەبلیغاتی حیزبی پرسیارم لێ کردن . بۆم دەرکەوت کە ئەو برادەرانە زۆر زەحمەت دەکێشن، خۆ لە مەترسی داوێن ، بەلام بۆ تێکوشان و کاری تەشکیلاتی بەرنامەیان نیە . لەو بارەوە هێندێ پێشنیارم دان و داوام کرد کە کۆنفرانسێکی حیزبی ببەسترێ و نەخشەو بەرنامەیەك بۆ تێکوشان دابن درێ. بەڵێنی یان دا کە بگەرێنەوە بۆ لای یانەو لە گەڵ برادەرانی مەسئول باس بکەن .

گەرامەوە بۆ مەهاباد لە لای وەستا برایم کارەکەم درێژە پێدا . رۆژێکی هەینی کە بێکار بوم ، سواری ماشین بووم و چوومە نەغەدە. کاتێك لە گاراژ دابەزیم، ژاندارمەیەك هاتە پێش و گوتی : " لە ئیدارەی ژاندارمە بانگت دەکەن " . بێ ئەوە کە رێگا بدا بچمە نێو بازارو کەسێك ببینم وەپێش خۆی دام بۆ ئیدارەی ژاندارمە . کاتێك چوومە ژور، سرگورد ئەحراری سەرۆکی ژاندارمەی نەغەدە گوتی : " ئاغای حیسامی لە روکنی دوی سوپا دەستور دراوە کە هەر بەو ماشینەی پێ هاتووی بتگێرمەوە بۆ مەهاباد . حەقت نیە بێیە ئەولایە "گوتم بە توندی ئیعتراز دەکەم . سندوس ئێرانە، منیش ئێرانیم . چەند ساڵ ماڵم لێرە بووە ، دۆست و برادەرم هەن. چۆن لە ئێراندا رێگای هات و چۆ دەگرن ؟

گوتـــــی :
ــ خۆت دەزانی وەختی ئیعترازتیە٠ پێم خۆشە بۆ خۆت سواری ماشین بـــی و بچیەوە مەهاباد ، دەنا ناچارم لە گەڵ ژاندارمە بدنێرمەوە ٠
دیتم مەسەلەکە توندە٠ ئوتۆبوس هات سوار بووم و چوومەوە مەهابــــــاد ٠ بەیانی تازە لە خەو هەستابووم گروبانێك هات و بردمی بۆ روکنـــــــــی ۲ ٠ سەرهەنگ سالاری زادە سەرۆکی روکنی ۲ بێ ئەوەی هیچ بلێ وەپێشم کـــەوت و بردەی بۆ ستادی لەشکر ٠ کە چووینە ژور سوپەبود وەرەهرام لە گەڵ حاجـــــی سالّحی شاتری دانیشتبون ٠ سالاری زادە دەستی بەرز کردو قاچی لێك دان و گوتـــــی :
ــ تیمسار!حیسامی حازرە ٠
وەرەهرام سەری هەلێنا و گوتـــــی :
ــ تۆ چی و چت دەوێ ؟ بۆ هەدا نادەی ؟ نەی هێشت وڵام بدەمەوە ، رووکردە حاجی سالّحی شاتری و بە منی گوت : " ئەم ئاغایە دەناسی " ؟
ــ نەخێر نای ناسم ٠ من حاجی سالّحم باش دەناسی ٠ دەمزانی چۆن لـــــــە خزمەتی رێژیمی دیکتاتۆری و چەپەڵی شا دایە ٠ هەر بۆ ئەوە کە بە هـەنـدی نەگرم و بە هیچی بزانم گوتم : نەخێر نای ناسم ، نازانم ئەوە کێیە٠ تـــورە بوو گوتـــی :
ــ چۆن ئاغای حاجی سالّحی شاتری ناناسی ؟ بەلێ دەبێ نەی ناسی ، چونکـــە ئەگەر تۆ بی ناسی ، ئیتر ئەو ئاغای حاجی سالّحی شاتری نیە ٠
پاشان روی کردە سالاری زادەو گوتـــی : " حەقی نیە لە مەهاباد وەدەرکەوێ" بەم جۆرە بە کردەوە کەوتمە ژێر چاوە دێری پولیس و دەبوایە هەمـــوو رۆژێ بچمە روکنی ۲ خۆم نیشان بدەم٠ هێندێ رۆژ نەدەچوم ، گروبان یا ئیستیوار- یەکی روکنی ۲ م دەبینی دەم گوت : " شاهید بن لە مەهاباتم !
کار لە لای وەستا برایمی دارتاش بێجگە لەوە کە مانگانەیەکی کەم بـوو ، فیز و پریستیژی سیاسی منیشی دێنا خوارێ ٠ لە کۆمەڵی دواکەوتوی کوردە- واری دا دەژیام ٠ لە زۆر کەسم دەبیست دەیان گوت : " نەتیجەی زینـــدان و

گوێرەوەری لە ڕێگای میللەت دا هەر ئەوەیە • هەستم بە خۆ بە کەم زانیـــن دەکرد • لە لای وەستا برایم دەستم لە شاگردی هەلگرت و بێکار مامەوە • چەند جار چوومە لای سەرۆکی شارەبانی مەهاباد ، داوام لێکرد کە کارم بـۆ پەیدا بکا • سەرۆکی شارەبانی سەرهەنگێکی پیرو پیاوێکی خراپ نەبـــوو ، کۆنە ژنی سمایل ئاغای سمکۆی مارە کردبۆوە ، دەیویست لە گەل خەلك چاکە بکا • دوو سێ جار چوومە سەری و داوای کارم دەکرد • ڕۆژێك گوتی :

ــ لە گەلْ ئەو دەستەیە کە ما لاریا دەپرژێنن کار بکە • بە مەهەندیس دەلێم حقوقی باشت بداتێ • خۆت لە گەلْ ئەو بخافلێنە •

ــ زۆر باشە ، ئەو کارە دەکەم • من لە خوام دەویست کارێکی ئاوا پەیدا بێ کە بتوانم لە مەهاباد بچمە دەرو لە دێهات بسورێمەوە • دۆست و بـــرادەران ببینم و بۆ تێکوشانی حیزبی ڕێ و شوێنێك بدۆزمەوە بۆم دەرکەوتبوو کە لـــە ناوچەی مەهاباد ریگحراو تێکۆشانی حیزبی لە گۆڕێ دا نیە • دەرفەتێکـــی باش بوو ، دەمتوانی ئەندامانی پێشوی حیزب ببینم و بۆ تیکۆشـــــان ئامادەیان بکەم •

سەرهەنگی شارەبانی موهەندیسی بەر پرسی ( دەستەی خەبـــات دژی ما لاریا " ی بانگەکردو وتی : " دەبێ حیسامی بە مسئولی دەستە بنوســی و حقوقی باشی بدەیە " •

لە گەلْ مەهەندیس بومە ئاشنا ، دە کەسی دیکە لە گەنجانی مەهاباد لەگەلْ ئەو دەستەیە کاریان دەکرد هەموویان کوڕی باش بوون، ڕێزێکی زۆریان بۆ مــن دادەنا • نێزیکەی چل ڕۆژ ناوچەی شارویران و مەحالی شازادەو بەریەپرانـان گەڕاین • زۆربەی برادەرانی پێشوی حیزبیم دیتنەوە قەرارو نیشانەی پێوەندی تایبەتیم لە گەلْ دانان • هێندێکیان ئەرکی تایبەتیم پێ ئەسپاردن• لە گـــەلْ موهەندیس باش ڕێك کەوتبوم • پێشنیاری دەکرد لە گەلْ ئەو بچمە تاران وە لە ئیدارەی " خەبات دژی ما لاریا " دام بمەزرێنێ • لەو ماوەیەدا ڕۆژی شـــەش تمەنی بۆ من دەنوسی ، ئەوە یارمەتیەکی گەورە بوو •

ڕوژێك لای ئێواری لە گوندی " باین دەری " دەگەڕاینەوە بۆ نیگبەتی لـــە

سەر پردی مەهاباد تووشی وەرمەرام بووین • من لە پێشەوەی ماشین سوار ببوم کە چاوی بە من کەوت ماشینەکەی راگرت پرسی :
ـ ئەوە لە کوێ دێنەوە ؟ تۆ بۆ چی لەو ماشینەدای ؟
ـ لە گەڵ ئەم دەستەیە کار دەکەم ، بێکار ناژیم و دەبێ کار بکەم• برێکی جنێو بە موهەندیس داو گوتی : " بیانوی باشت بۆ رێك کەوتوە کە حیزب زیندو کەیەوە ، دابەزەو برۆ• لە مەهاباد وەدەر نەکەوی"•
لەو بەینەدا قەرەنی ئاغای پیران لە مەهاباد هاتە لام گوتی : " ماڵە ـ کەت بێنە لای من ، دەسەڵاتی خۆم هەموو لە بەر دەستی تۆدەنێم ، زۆر چاکت بە خێو دەکەم • " زۆرم پێ خۆش بو لە مەهاباد بچمە دەر و لە گوندێك دانیشم و لە بەر چاوی حکومەت نەبم • چوومە روکنی ۲ بە سەرهەنگ سالارزادەم گوت : "دەچمە گوندی شین ئاوا لە لای قەرەنی ئاغای پیران دامەزراوم لەوێ دەبم "
ـ حەقت نیە لە مەهاباد وەدەر کەوی •
لەم بێکاریەدا کاك هەباسی کوڕی کاکە رەزای ماسوێ قەت لێم خافڵ نەبوو ، لە هەموو بارێکەوە یارمەتی دەدام • ناتوانم چاکەی ئەو جوامێرەم لە بیر بچێتەوە •
رۆژێك لە شار تووشی قادر ئاغای ماسوێ بووم بۆ نیوەرۆ بانگێشتنم کرد • دیارە ماڵ و وەزعێکی ئەوتۆم نەبوو کە ئاغایەك بانگێشتن بکەم• بەڵام پێم خۆش بوو لە گەڵ زۆر کەس دۆستایەتی درێژە پێ بدەم • قادر ئاغا بۆ نێوەڕۆ هاتە ماڵ و عەلی شەوقی لە گەڵ خۆ هێنابوو • میرزا عەلی شەوقی ئەو دەم مامۆستای مەدرەسەی ماسوێ بوو • نان و چێشتێکی خۆمانەمان ساز کردبوو• نانمان خواردو چامان دەخواردەوە، باسی سەردەمی کۆماری کوردستان و وەزعی سیاسی ئەو دەم هاتە گۆڕێ • ئەو مامۆستا بێشەرەفە بێ پێشەکی دەستی کرد بە جنێو دان بە پێشەوا و بە قەبری قازی محەمەد • هیچ مەعلوم نەبوو ئەو بێ نامووسە چ کاری بە پێشەوا دابوو• من خۆم پێ رانەگیرا گوتم :
کەسێك قسە بە قازی بلێ گو بخوا باشترە • لە گەڵ قادر ئاغای نەبای،

خـــــــــراپم پێ دەکردی "

قادر ئاغا زۆر تێك چوو ، گوتـی : میرزا عەلی(1)ئەم قسانە لە تۆ زیادیـن، پیاوی وەك قازی لە کورد هەڵ نەکەوتوە " روی دەمن کرد و گوتی : " کاك کەریم ببورە من لە هاتنی ئێرە پەشیمانم ٠

---

(1) ئەو میرزا عەلی یە بێ شەرەفە کە دۆستێکی گیانی حەسەنی شەرەفــــی بوو بە فێڵ و تەڵەکە زەوی و زاری هەمزەی برای قادرئاغای ماسوێ داگیرکردبو، ئەو کابرایەی لە ساجی عەلی دانابوو - پاش روخانی رێژیمی شا هەمزەئاغا لـە حیزبی دیموکرات شکایەتی کردو سەنەدو بەڵگەی زۆری نیشان دان ٠ مـــــن کە بەر پرسی تەشکیلاتی مەهاباد بوم نوسیم کە حاسڵی زەوی و زاری داگیــر- کراو بدەنەوە بە هەمزەئاغا ٠ بەلام کاك حوسێنی مەدەنی کە لە لایەن کۆمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە کرابوو بە بەر پرسی کۆمیتەی زەوی و زار ، سابلاخی گەری گوڵی کردبوو ، بۆ دیفاع لە عەلی شەوقی نەیهێشـــــت بریاری تەشکیلاتی مەهاباد بچێتە سەر ٠ کاتێك دوکانی " ئەسکەنــــدەری " حاسومان دەکردە کتێبخانەی پێشەوا ، کاك کەمالی شافعی هات گوتــــــی : ئەو کابرایە " میرزا عەلی شەوقی " هاتوە بە ئاشکرا دژی حیزب قسە دەکا ٠ من قسەکانی ئەو خۆ فرۆشەم هەر لە بیر مابو، پێشمەرگەم نارد کە بیگـــــرن، بە داخەوە خۆی شاردبۆوەو نەیان دۆزیەوە ٠ پاشان چەند جار بە تەشکیلاتــــی نەغەدەو مەهابادی حیزبی دیموکراتم گوت کە ئەو کابرایە زوڵمی لە هەمـــزە ی کوری کاکە رەزا کردوە ، بە ئاشکرا دژی حیزب کار دەکا پێویستە لێ بدرێ و تەمبێ بکرێ ٠ لە مەهاباد حەسەنی شەرەفی و لە سندوس مستەفای مسئولــــی رێکخراوی دایمار پشتیان دەگرت و هەر وا مایەوە٠

دایکم پیرو نەخۆش دەیویست ژن بێنم . بەڵام ژن هێنان بەر لە هەمو شت پوڵی دەویست ، منیش بێ پارە بوم . کچە ئاغایەکی ناوچەی مەهاباد کە لە گەڵ باب و براکانی زۆر دۆست بووم پێ دادەگرت کە بی خوازم . پێم دەگوت من هیچم نیە ، چارە نووسم زیندان و دەربەدەرییە . تۆ نادەن بە من ، خۆشە ـ ویستی ئێمە بێ نەتیجەیە . هەر ئاواش بوو .

بریارم دا کە کچی کاک ئەحمەدی ئاهەنگەری بێنم لە هەموو بارێکەوە بۆم دەلوا . بێجگە لە دوستایەتی لە گەل کاک ئەحمەدو ویستی دایکم کە تەنیا لە سەر هێنانی ئەو پێ دادەگرت ویستی خۆم و کچەکەش باشترین دەرفەتی پێک هێنابوو . بەڵام لە ترسی سازمانی ئەمنیەت بابی تەی دەوێرا کچەکەم لێ مارە کا، یا بە گوێرەی داب و رەسمی کوردەواری بمداتێ . ناچار ۲۷ی رەزبەری ۱۳۳٦ نوامبری ۱۹۵۷ چوومە نەغەدەو کچەکەم لە گەڵ خۆم هێنا . دەفتەری مارە و تەلاقی مەلا عبدوالرحمانی سرنج داغی نامەی بۆ بابی کچکە ناردو پێ را ـ گەیاند کە ئەگەر تا ۱۵ رۆژ بۆ مارە کردنی خەجیجی کچت لە کەریمی حیسامی ئامادە نەبی، دەفتەر لێی مارە دەکا .

چوکەڵی گەوهەری نامەکەی بردە نەغەدە . کاک ئەحمەدی بابی کچەکە گوتبوی من ناوێرم لێی مارە کەم، با دەفتەری مارەو تەلاق بۆ خۆی بریار بدات. پاش ۱۵ رۆژ مەلا عبدوالرحمانی سرنج داغی کچەکەی لێ مارە کردم . جارێکی دیکەش پاش مردنی دوو ژن و دو منداڵ و تێکچوونی ماڵ و حاڵ بوومەوە بە خاوەن ژن و بەرێ چوونی خێزانیکی گەورەترم کەوتە سەر شانی .

## سەفەری سەر شایی

خزمێکی چوکەڵی گەوهەری لە گوندی (پەڵکێ) نیزیك گوندی کەوتەر بە ناوی "ئەحمەدی چوکەلی" رۆژێك هات لێی گێڕاینەوە کە بچینە سەر شایی . لە لایەك پێم خوش بوو ، لە جێگای ئاوا مرۆڤ خەڵك زۆر دەبینێ ، خەڵك دەناسێ ، دەتوانێ بیرو بروای سیاسی بە شێوەی جۆر بە جۆر بلاو بکاتەوە . لە لایەکی تر سەر شایی پارەی دەوێ، بێ پارە بچیە سەر شایی ئەگەر ئابڕو چوون نەبێ کەیبەو چاوبەرەژێریە .

میرزابرایمی حەربی لە گەڵ کاك چوکەل هەڵیان پێچام لە گەڵیان بچم.
میرزا برایم گوتی : پارە هیچ نیە ئەوەندە پارە هەیە کە شاباش بدەی. چوم بە سالاری زادەم گوت : دەچمە سەر شایی . پاش ئەوەی کە بڕێکی هەرەشە کرد گوتی بچوو.

لە گەڵ میرزا برایمی حەربی دچوکەل کەوتینە رێ . گوتم با بچینە گوندی دێبوکر ، نیوەڕۆ لە ماله کا خدری نان دەخوێن ، ئەسپێکیان لێ وەردەگرم بە سواری دێم . نیوەڕۆ لە دێبوکر لامان دا . ماڵە کا خدری زۆر بە گەرمی پێشوازیان لێ کردین ، نان و چێشتێکی باشیان بۆ ساز کردین . پاش نان خواردن ماینی کاك قادریان بۆ زین کردم و بۆیان هێنام . سوار بووم و کەوتینە رێ . لە گوندی وەدەر کەوتبوین ، مامە رەشی پیاوی کاخدری بە غار وەدوامان کەوت و بانگی کرد کە راوەستین . کاتێك هات لە چوکەل و میرزا- برایمی جیا کردمەوە، گوتی کارم پێتە . بڕێك وەدور کەوتین. پەنجاتمەن پارەی هێنا دەرو گوتی ئەوە "پای بەگم" بۆی ناردوی (پای بەگم کچی کا خدری دبیوکری بوو . کا حوسێنی کەوتەر تەلاقی دابوو. لە ماڵە بابی دم راست و خاوەن دەسەلاتی ئەو ماڵە گەورە بوو )

گوتم : هیچ مانای نیە ، من پای بەگم ناناسم ، نەم دیوە بۆچی ئەو پارەی بۆ من ناردوە ؟ مامە رەش گوتی : لەوەی گەڕێ پێم وایە خۆی لێ خۆش کردوی. گوتویە دەچێتە سەر شایی رەنگە پارەی نەبێ . پەنجاتمەنم وەرگرت وگوتم:

" زۆر سلاوی لێ بکە "

لە سەر شایی خەڵکێکی زۆر کۆ ببۆوە • دەرفەتێکی باش بو • چاوم بە زۆرکەس کەوت • هێندێ ئاغای مەنگوڕ بۆ سەر شایی بانگ کرابون • شەوێ قوماریان دەکرد • یەك دوو کوڕی مێر مندالی ئاغاکانی سیاقوڵ لەوێ بون زۆر لە دەورەم دەبون و شتیان لێ دەپرسیم وەك لە بیرم مابێ، یەکیان ناوی سوارە بوو. هاتنە لام گوتیان دەبێ قوماری بکەی • گوتم نازانم قەت قومارم نەکردووە • هەر یەکە پێنج تمەنیان هێنا دەرو دایانا گوتیان دەبێ تۆ قوماری پێ بکەی • من لە ژیانم دا قومارم نەکردبوو ،بەلام دەستم پێ کرد، بۆم دەهات کاتێك قومار تەواو بوو سەت و بیست تمەنم بردبۆوە • پوڵەکەم دا بە کوڕەکان، هەرچی کردم وەریان نەگرت • گوتیان هەر پێمان خۆش بوو بەشداری بکەی • بە کورتی پارەیان لێ وەرنەگرتم ، کاتێك لە شایی گەڕاینەوە سەت و حەفتا تمەن پوڵم هەبوو •

تازە ژنم هێنابوو دەبوایە لانی کەمی جل و بەرگی بۆ بکڕم • بیرم کردەوە ئەگەر بچمە زینوێ شێخی هەم هەرزانتر شت و مەکی بۆ دەکڕم هەم رەنگە هێندێ کەسیش ببینم • بۆ سەفەری زینوێ ولاخی سواری پێویست بوو • پارەم لە میرزا برایمی حەربی وەرگرت کە بارگینێك بکڕم • چوومە بازاڕی مەهاباد کە ئێواران لە نێزیك قەبران کۆ دەبوونەوە ئاژەل و یەك سم و رەشە ولاخ و رۆن و پەنیری لێ دەفرۆشرا •

لە مەهاباد هێندێ کەسی بێکارەو بەرەڵلا و مفتە خۆرو سەرسەری فێر ببون لە سەر حیسابی خەڵکی گوندی نەخوێندەوارو فەقیرو هەژار دەژیان • نێوی خۆیان نابوو " دەلال " کابرای دێهاتی ماست و پەنیرو رۆن و خوری و دانە ـ وێڵەی بۆ فرۆشتن دەهێنا بازاڕ • لە دەرەوەی شار پێشیان پێ دەگرت شتەکەیان لێ وەردەگرت و کابرای خاوەن وەك سوالکەر وەدوایان دەکەوت • دەیان برد بە کەیفی خۆیان دەیان فرۆشت ، خاوەن شتەکە دەبوایە دەست بگرێتەوە هەرچی دابایانێ ئەوە بوو، نەی دەوێرا دەنگ بکا • ئەگەر وە دەنگ هاتبا جاری وا هەبوو لێشیان دەدا • وردە بۆرژوازی شاری مەهابادو بیرو ڕای

گشتی زۆر باش ئاگاداری ئەو ناحەقی‌یەو بێ ویژدانیە بوو. بەڵام لە بەر ئەوە کە هەموو تەنیا لە فیکری دەس بڕی و چەوساندنەوەی هەژارو وەدەست هێنانی قازانجی تایبەتی دا بوون، کەس وەدەنگ نەدەهات.

یەك دو جار ئەو مەسەلەیەم لە گەڵ هاوڕێیانی حیزبی هێنا گۆڕێ و گوتم: ئەو تاقمە سەر سەرییە ڕەش و ڕووتی گوندیان ڕوتاندۆتەوە، پێویستە بە شێوەیەك پێشی بگرین. فایدەی نەبوو، چەند کەسیش لەوانەی کە ناوی ئەندامەتی حیزبیان لە سەر خۆ دانابوو ڕەگەڵ ئەو تاقمە کەوتبوون و شەریك بوون و لەم ڕێگایەوە بەڕێ دەچوون.

ئەگەر عەزیز نەسینێکی کورد هەبایە دەیتوانی چەند کتێب لە سەر کردەوەی چەپەڵی ئەو تاقمە لە مەهاباد بنووسێ. دەلاڵ و کریارو دوکاندار هەموویان شەریك بوون و خەڵکیان دەڕوتاندەوە. ڕێگاکانی شارو گەڕەکەکانی بازاڕیان لە نێو خۆ دابەش کردبوو. هەر دەستەی چەند کەسێکی بۆ سەر ڕێگایەك و بۆ مەیدانێك دەنارد. یەك خۆی دەکردە کڕیار، یەکیش دەبوو بە دەلاڵ. نەیان دەهێشت کابرای گوندی دەرچێ و بە هەر فڕو فێڵێك بایە دەستیان دەبڕی.

چوومە بازاڕ بارگینێکم کڕی بە ١٢٠ تمەن. پوڵەکەم دابوو، بارگینم ڕادەکیشا بێمەوە نێو شار. دیتم دو کەس لەو دەس بڕ و گوێبڕانە پەیدا بوون زۆر سەیر بوو کە نەیان دەناسیم. پرسیان:

ــ ئەو بارگینە دەفرۆشی؟

ــ نا کڕیومە.

ــ بە چەندت کڕیوە؟

ــ بە هەرچەندی بێ لە گەڵ خاوەنەکەی ڕێك کەوتوین، تازە تەواو بووە.

ــ ئەدی دەلاڵی ئێمە؟

ــ دەلاڵی چی؟ ئێوە چکارەن؟ شەرم ناکەن لە جیاتی کارو کاسبی بە دەلاڵی دەژین؟

من بۆ نێو شار دەهاتمەوەو ئەوانیش وەدوام کەوتبون. جارو بار دەیان گوت: خۆت پیاو خراپ مەکە دەلاڵیەکەمان دەیە با بڕۆین.

گرتم وەرن با بچینە کاروانسەرا ، لەوێ دەلاڵیتان دەدەمێ . گەیشتمە مەیدانی مەنگوڕان ، تووشی کاوسێنی حاجی لەتیف و محەمەدی ماملێ و رەشەی قاچاخچی بووم . چاك و خۆشێکی گەرم و گوڕ ، گوتم ئەوێ بزانن ئەوانە کێن چیان دەوێ بۆ وەدوای من کەوتون ؟ ئەوان دەیان ناسین کاوسێن گوتی :
هەتیو چۆن ئێوە کاك کەریم ناناسن ؟ بە خێر دەلاڵی لەویش دەستێنن ؟ بڕۆن بڕۆن شەرمێ بکەن . ئەوجار دەستیان هەڵ نەدەگرت :
ــ دەبێ بمان بەخشێ ... نۆکەری تۆین نەمان ناسیوی !

## سەفەری عێراق

رۆژێك لەگەڵ چەند قاچاخچی خەڵکی مەهاباد کە یەك دووێکیان دۆست و هاورێ بوون چوومە زینوێ شێخی . چەند رۆژێك لەوێ بووم . هێندێك شت و مەکی پێویستی ماڵیم کڕین و گەڕامەوە . لە گەڕانەوەدا شەوێ چوومە گوندی " قازیاوا " . ناسیارێکم لەوێ هەبوو دەبوایە لەگەڵ ئەو بەرۆژ شتەکان بێنمەوە نێو شار . برادەری ناسیار کە میوانی بووم پیاوانە سوار بوو هێندێ لە شتەکانی لە پاش تەرکی قایم کردو منیش هێندێ شتم لە خورجینێك دا بە سەر بارگین دا هێناو بەرەو مەهاباد کەوتینە ڕێ .
لە سەر بستوی تەقە دار سەرباز راوەستابوون . ولاتەکەی مە هەمیشە وەك ولاتی داگیر کراو ئەرتەش و ژاندارمە حوکمیان بە سەر دا کردوە . دەنا هیچ مانای نەبوو دەوروبەری شار بە سەرباز بگیرێ . بانگیان کردین راوەستاین دوو سەرباز هاتن خەریکی پشکنینی پاش تەرکی برادەرەکەم بوون تا ئەوان خەریك بوون ، من رکێفم لە بارگین داو بەرەو شار . هەرچەند دەنگیان دام کە راوەستم فایدەی نەبوو . گەیشتمە نێو شار چوومە ماڵی ناسیارێك ، بارگین و شتەکانم لە حەساری ئەوان دانا و گەڕامەوە بۆ بنکەی سەربازەکان کە لە سەر شەقامی سەربازخانە بوو . تەماشام کرد برادەرەکەی منیان گرتوە بە بار و بارگینەوە هێنایانە بنکەی سەربازەکان کە گروبانێك بەر پرسیان بوو .

گوتم : ئەو شتانە هەموویان ئی منن ، بۆ مالّی خۆم کریون، هیچیان بــــۆ فرۆشتن و بۆ بازار نین ٠ ئەو برادەرە بۆی هەلّگرتوم ئەگەر بیان دەن بـــــە گومرگیش هیچ بە ئێوە نابڕێ، شتەکانیشم دەدەنەوە ٠ بە گروبانم گـــــوت پەنجا تمەنت دەدەمێ واز بێنە ٠ کابرا پاش نەختێك چەقە راز ی بوو ٠

ــ بەلاّم پارەم پێ نیە، سەربازێکم لە گەلّ بنێرە ئێستا پارەکەت بۆ دەنێـرم٠ شتەکانمان هەلّگرتو بە برادەرەکەم گوت : تۆ برۆ شتەکان لە مالّی خوشکـــت دابنێ ، پاشان دە تبێنمەوە٠ سەرباز لە گەلّم هات هەتا گەیشتینەوە مالّـــی چووینە ژوورو پێم گوت : برۆ بە سەر گروبان بلێ پارەم نیە ٠ شتێکی بۆ مالّـــی خۆم بیکرم حەریمەی نادەم٠ سەرباز تاوێك راوەستاو ملی هیز کردو رۆیشـت ٠ پاش دوورۆژ گەراتەوەم لە عێراق بەیانیێك دوودیژبان هاتن و گوتیان لـــــە دیژبانی مەهاباد ویستویانی ٠ لە گەلّ خویان بردم بۆدیژبانی مەهاباد ئەفسەری کێشك گوتی :

ــ بە ئەمری بازپۆرسی سوپا تۆ زیندانی٠ بنێرە پێخەفت بۆ بێنن، چونکـــە هیچمان نیە پێ بخەوی ٠ سەربازێکم ناردەوە مالێ ، خێزانم لە گەل کچـــی خوشکم دەستە نوێنێك و نان و چێشتی بە گریانەوە بۆ هێنام ٠ دلخۆشیم داوە و گوتم :

ــ پێم گوتبوی چارە نووسی من هەر زیندان و دەربەدەریە٠ ئێستاش مەگـــری بچۆوە ئاگات لە دایکم بێ ٠

دوو رۆژ بە بێ پرسیار لە دیژبانی مەهاباد رایان گرتم ٠ نیوەرۆو ئێــــوارە خێزانم نانی بۆ دەهێنام و برێك دەگریا ٠ منیش دلّخۆشیم دەداوەو غیرەتــم وصبەر دەنا ٠

پاش دوورۆژ بردیانم بۆ ستادی لەشکر ٠ لە ئیدارەی بازپۆرسی ،سەرهەنـگ بەهارمەست بازپۆرسی سوپای مەهاباد داینام و دەستی کرد بە پرسیـــــارو لێکۆلّینەوە ٠ لە پێشدا ناو و نازناوو کارو جێگای دانیشتنی پرسی٠ پاشـــان گوتی بنووسە هەرچی لێت دەپرسم راستی بلێ٠ ئەوەم نووسی ٠ دەستی پێ کرد

ــ چەند زمانی بێگانە دەزانی ؟

ـ دوو زمانی بیگانه دەزانم ٠
ـ چی و چی ؟ بیان نووسە ٠
ـ فارسی و ترکی ٠
کاتیك ئەوەم نووسی، جەناب سەرهەنگ ئاگری گرت ، هەستا سەر پاشوان و نەڕاندی :
ـ ئەو قسانە چیە ؟ یانێ چی ؟ چۆن فارسی زمانی بێگانەیە ؟
ـ بەڵێ من کە کوردم بۆ من زمانی بێگانەیە ٠ من لە سەرەتاوە نووسیومە هەرچی لێم بپرسێ ڕاستی دەڵێم ٠ ڕاستی ئەوەیە فارسی و ترکی بۆ من زمانی بێگانەن ٠
ـ دەزانی ئەو قسانە بۆ تۆ بە گران تەواو دەبن ؟
ـ دەزانم ، ڕاستی گوتن لەو ڕیژیمە دا باسی سەرە ٠
ـ بە گوێرەی ڕاپورتی گەیشتو ، تۆ چوویە عێراق لەوێ چاوت بە هێندی کەسی دژی ڕیژیمی شاهەنشاهی کەوتوە ٠لەگەڵ ئەحمەدی ئاهەنگەری نەغەدەو چەند کەسی تر کوبوونەوەی حیزبیت هەبووە ٠ ڕاستیەکەی جواب بدەوە ٠
ـ ڕاستە چوومە زینوێ شێخی ٠ تازە ژنم هێناوە چووم هێندێ شت و مەکم بۆ خیزانم کڕیوە ٠ بەڵام هیچ کەسی دژی ڕیژیمم نەدیوە٠ ئەحمەدی ئاهەنگەری ئێستا لە گەڵ من نێوانی نیە ٠ کچم لێ هەڵگرتوە، مەسڵەتی لەگەڵ نەکردوم تو ڕەنگە نەختێك داب و شوێنی کوردەواری بزانی ، کەسێك کچی لە یەکێك هەڵگرت ناتوانێ کۆبوونەوەی حیزبی لە گەڵ بکا ٠ من ئێستا دەستم لە سیاسەت هەڵگرتوە ٠ ئێوەش بە ڕاپۆرتی بە درۆ بڕوا مەکەن٠
ـ لە بارەی عەلی ئەمیر عەشایری دەڵێ چی ، خۆ ئەو دوژمنی تۆ نیە ؟
ـ ساڵی١٩٤٨عەلی ئەمیر عەشایری جەلالی لە من ئەستاندبوو ٠ شکایەتم لێ کرد حەیوانەکانم لێ ئەستاندەوە ٠ ئەگەر لە بیرت بێ تو ئەو دەم حوکمی ئەستاندنەوەی حەیوانەکانت نووسیوە٠ تو ئەو دەم لە ورمێ لە ڕوکنی ٢ دابوی٠ وڵامەکانی پێ ئیمزا کردم گوتی : گوتی بیبەنەوە زیندان ٠
پاش دوو سەعاتان بانگیان کردم، گوتیان ئازادی عەمبالێك بانگ کە

نوێنەکانت بۆ هەڵگرێ· بۆ خۆم نوێنەکانم هەڵگرت و کاتێك لە ماڵــێ وەژور کەوتم ، ئیتر دایکم و خێزانم لە خۆشیان واقیان وڕما نەیان دەزانی بڵێن چی بریارم دا ئیتر نەچمەوە عێراق ، هەوڵ بدەم کارێك پەیدا بکەم· بەلای گەورەتـر لە بێکاری و نەداری نەخۆشی دایکم بوو· دایکم تووشی نەخۆشی سیل هاتبـوو پێویستی بە دەرمان و ئامپولی زۆر هەبوو· لێرەدا پێنووسەکەم لە توانای دا نیە پیاوەتی و جوامێری عەولای حەکیم زادە بنووسێ · یارمەتی و مروڤایەتی ئەو هەرگیز لە بیر ناچێتەوە · یەکی دیکە کە پێویستە ئێستاش زۆر سپاسی بکەم و چاکەی ئەو لە بیر نەبەمەوە سەیزادە ئیفتیخاری بورکە لە شێـــــــرو خورشید پەرستار بوو· زۆر بە دڵسۆزی دەهات ئامپولی لە دایکم دەدا و لـــێی دەپرسی و دەرمانی بۆ دەهێنا · بەلام هەتا ژنم نەبوو ئەو هیوایەکی دیکەشی هەبوو کە بەداخەوە نەگەیشتە حێ · چوکەلی گەوهەری هەموو جارێ دەیگـــوت: "لە ئاهی سەیزادە نەحاتیت نابێ "

ڕەنگە خەتا باریش بووبم چوونکە جارو بار وا دەبزووتمەوە کە سەیـــــزادە هومێدێکی بۆ پەیدا بێ ·

لەوانە لە هەموان گرنگتر و جیگای سوپاسی هەڵوێستی سەروان هێروئابادی بوو· ئەفسەریکی گەنجی سوپا لە مەهاباد و دوکتۆرێکی باشبـــوو·

ئێواران شوێنی تەماشا کردنی نەخۆشانی هەبوو، خەڵکێکی زۆر دەچوە لای منیش روژێك دایکم بردە لای دوکتۆر و تەماشای کرد · کاتێك دەرم هێنا کــە پولی بدەمێ ، لام وایە دووتمەن هەقی تەماشا کردنی وەردەگرت · پولەکــەی نەویست · چەند ئامپول و شوشەیەك حەبی دامێ و گوتی پاش ئەو حەبانـــــە بیهێنـــەوە ·

جارێک خێزانم نەخۆش بوو، چووینە لای دوکتۆر هیروئابادی پاش تەماشـا کردن و هێندێك دەرمان کەوتە سەر پرسیاری ژیان و کارو بەرێ چوونـــــــم وەزعی خانوو جێگای دانیشتنی پرسی · پێم سەیر بوو· ئەفسەری ئەرتەش بۆچی باسی ئەو شتانە لە گەڵ من دەکا !

گـــوتی : " دایکت زو زو بێنە ، مەهێلە دەرمانی لێ ببرێ· دۆستایەتیــــم

لە گەڵ دوکتۆر هێرو ئابادی تا دەهات پتەو تر دەبوو• زۆرجاران بێکار دەچوومە لای دادەنیشتم • هەمیشە بە خۆشی پێشوازی لێ دەکردم،هەموو جارێ لە نەخۆشی دایکمی دەپرسی • روژێك لە پڕ لە ماڵەکەمان وەژور کەوت تاقە دیوێك چوار کەس تێدا دەژیاین دوکتۆر گوتی : " ئەم ژورەی ئێوە بۆ ژیان نابێ ، دایکت نەخۆشی سیلی هەیە • خێزانت و خوشکە زاکمت گەنجن مترسی ئەوە هەیە کە ئەوانیش بگرنەوە "

گوتم : جێگای باشترم وەگیر ناکەوێ • بە تایبەت خاوەن ماڵەکەمان ئەوەندە باش و دڵسۆزن زەحمەتە لە هەموو مەهاباد خاوەن ماڵێکی ئاوا وەگیر بکەوێ خەڵك من زۆر دەناسێ، دێنە ماڵمان ، لە مەهاباد هەموو کەس رێگا نادا خەڵکی بێگانە هات و چۆوی حەساریان بکا • ماڵی مام ساڵح بە تایبەت نوسرەتە خاتون ئەوەندە باشن هەتا مردن چاکەی ئەوان نادەمەوە" دوکتۆر گوتی : " بچۆ شیرو خورشید داوا بکە با دایکت بنێرنە تاران بۆ نەخۆشخانەی تایبەتی نەخۆشی سیل • منیش بە سەرهەنگ کەدخودایان دەڵێم، بەڵکو موافقەت بکا • من بە نامە دەنووسم کە پێویستە ئەم نەخۆشە بۆ تاران بچێ "

تەگبیرێکی باش بوو، نووسراوهیەکم لە دوکتۆر هێروئابادی وەرگرتووچومە شێرو خورشید، نامەیەکم نووسی دام بە سەرهەنگ کەدخودایان • گوتی پاش دوو رۆژی دیکە وەرەوە • کاتێك پاش دووڕۆژ چوو مەوە گوتی : "ناتوانین بینێرین • تۆش ناتوانی لە گەڵی بچی روکنی ٢ چوونەدەری تۆی لە مەهاباد قەدەخە کردوە • تۆ چکارەی ؟ بۆ چی لە گەل تۆ یەك نین ؟ "

گوتم : من نەم توانیوە خراپەی دەوڵەت بکەم بەلام مەعمورەکان بێ لوتفن•

پاش چەند رۆژ چوومە لای دوکتۆر هێروئابادی • گوتی : " هەموو شتێك دەزانم لە منیان پرسیوە ئەم نوسراوەت بۆ چی بۆ حیسامی نوسیوە؟ لە وڵام دا گوتومە : من دوکتۆرم، وا تێ گەیشتوم کە ئەو نەخوشە پێویستە بچێتە خەستە خانەی شائاباد •

بەم حاڵەش دوکتۆر هێروئابادی لە هیچ یارمەتیەك بە نەخۆشی دایکم

دەستی نەدەگێراوە • بێجگە لەوە ئەگەر دۆست و برادەری گوندیش نەخـــــۆش دەبوون دەم بردن بۆ لای دوکتۆر هێروئابادی و زۆرجار بێ پارە تەماشـــــای دەکردن•

## نـە خۆشیکــــــی دیکـــــــــە

دایکم نەخۆشی سەرپێ بوو ، پێویستی بە حەسانەوەو هەوای خاوێن و خواردەمەنی باش هەبوو• بە داخەوە هیچیان بۆ من دەرمتانیان نەبوو• وەك گوتـــم تاقە ژورێکمان هەبوو بۆ چوار کەس ، سەرەڕای ئەوە میوانیشمان دەهات •

ڕۆژێك لە پڕ تەماشام کرد کاك قادری کوڕی کاخدری دیبوکری لە گەڵ دوو زەلامان نەخۆشێکیان لە ولاخ دابەزاندو بە کۆڵ هێنایانە ژور • کیژێکـــی پازدە ساڵە ، نەوەی کاخدری دیبوکری بە ناوی گوڵی • ئەم کیژە دایکـــی نەمابوو بە منداڵی هێنابویانەوە ماڵە باپیری لە لای بابی نەدەژیا • کیژێکی لە رادە بەدەر جوان، کولّمەی وەك دەنکی هەنارو بە ڕاستی گوڵی بەراستی بوو دایکم و خێزانم گورج جێگایان بۆ چاکردزۆر نەخوش بوو• خێرا چووم دوکتۆرم هێنا تەماشای کرد دەرزی و دەرمانێکی زۆری بۆ نوسی• کاك قادری خاڵـــی دوو رۆژ لە مەهاباد لە ماڵێکی دیکە مایەوە، ڕۆژانە دەهاتە ماڵی ئێمەو لـە لای گوڵی دادەنیشت • پاش چوار رۆژ حاڵی باشتر بوو، وەقـە هـــــــات خواردنی سوکی دەخوارد • دایکم زۆری پێوە ماندو بوو خزمەتی دەکرد •خاڵـی بەجێ ی هێشت و کیژەکە لە ماڵی ئیمە بە نەخۆشی مایەوە• هەموو رۆژێ لـە گوندیەوە پیاوێکیان دەناردو لێیان دەپرسی •

دوکتۆر هەموو رۆژێ دەهات سەری دەدا • گوڵی وردە وردە دادەنیشـــــت ، هەڵ دەستا لە ژورێ دەهات و دەچوو• ڕۆژێك کە دەچوومە دەرێ کاتێك وەدەر کەوتم دایکم بانگی کردم • گەڕامەوە گوتی : " گوڵێ دەڵێ نابێ بچێتە دە ر، ئەگەر ئەو دەڕوا حالم خراپ دەبێ " چووم لە پەنای دانیشتم ، دڵخۆشیـــــم داوە گوتم ئێستا دێمەوە ، کارم هەیە دەبێ بچمە دەرێ • کاتێك هەلدەستـــــام

هەر دووگد باسکی هاویشتە ئەستوم گوتی : " ناهیلم... بەحیم مەهیلە ....."
دایکم گوتی دانیشە ئیستا دیتەوە سەر خۆ...

تا دەهات گولێ باشتر دەبوو. دوکتۆر گوتی : هێندێ دەرمان لە گەل خۆی بەرێ دەتوانێ بچیتەوە" خالێ هات کە بیباتەوە ، دەستی کرد بە گریان دەیگوت نایەمەوە دیبوکری هەر لێرە دەبم. چەند رۆژێکی دیکەش گولێ لە مالێ ئێمە مایەوە. رۆژی ۲۱ی سەرماوەزی ۱۳۳٦ ویستم لە گەل خێزانم بچینە تەماشای رێژەی سەربازان. گولێ گوتی منیش دەبێ لە گەل خۆتان بەرن. چووینە سەر شەقا م ، دەستی منی گرتبوو بە ری نەدەدا . کاتێک لە شەقام راوەستابووین خێزانم و خوشکەزاکەم لە ئێمە دورکەوتبوونەوە.گولێ گوتی : " تو ئەو خودایە مەهێلە بچمەوە، دەمەوێ هەمیشە لە کن تۆ بم "
گوتم : ئێستا بچۆوە من حارو بار دێمە دیبوکری سەرت دەدەم باش نیە لێرە بمێنیەوە. گریا گوتی : نامەوێ بچمەوە دەمەوێ لە کن تۆ بم . چەند رۆژ پێ چوو دو خالێ هاتن کە بیبەنەوە . کاتێک وەدەر دەکەوتن لە کن خالێ و لە لای دایکم و خێزانم ئامبازم بوو دەستی دەئەستوی کردم و ماچی کردم. لە کوردەواریدا زەحمەتە شتی ئاوا رو بدا . هەوەل جار بوو ببینم کیژێک لە کن خەلک و لە پێش چاوی کەس و کاری خۆی پیاوێکی بێگانە ماچ بکا .

هەر چوونێک بوو گولێ چۆوە. حەوتویەک پێ نەچووبوو ئێوارەیەک درەنگ پیاوێکی کاخدری دیبوکری بە هەرەمە گەیشتە مالێ ئێمەو نامەیەکی کاخدری پێ بوو. لە نامەکەدا نووسیبوی : " وەزعی گولێ گەلێک خراپە تکایە بە هەر قیمەتێک بێ دوکتۆرێک لە گەل خۆت بێنە ، چاوە ڕوانیین"

ناچار بەو شەوە هەولم دا دوکتۆر هێروئابادی بدۆزمەوە نەم توانی لە سەربازخانە کێشک بوو. چوومە مالە سەرهەنگ کەدخودایان سەرهەنگ هاتە دەرێ و پرسی بەم شەوە چ قەوماوە ؟ روداوەکەم پێ گوت ، گوتم : هەرچەندی بلێی پارەت دەدەمێ، تکایە لە گەلم وەرە بۆ دیبوکر ".
ــ ئێستا شەوە ، دیبوکر دورە دەبێ سەد تمەنم بدەنێ .
ــ زۆر باشە چەندی بفەرموون دەیدەن .

بانگی شوفێری کرد سواری ماشین بوین و سەعاتی ٩ی شەو گەیشتینە دیبوکر ٠ ماڵی کاخدری زۆر پەرێشان بوون ٠ گوڵی بێهۆش بوو٠ ژن لە دەورەی دەگریان دوکتۆر تەماشایەکی کردو ئامپولێکی لە باسکی دا ٠ خوێنێکی رەشی لە باسکی هات ٠ گوڵێ چاوی هەلێنا ، چاوی گیران من چووم لە پەنای دانیشتم دەستم گرت گوتم چۆنی ؟ بۆچی وا نارەحەتی ؟ سەری هەلێناو ، سەری لە باوەشی من نا گوتی ئێستا باشم ٠

ژنەکانی ماڵی کاخدری پوری و خالۆژنەکانی پێکەنین گوتیان:

ــئەوە بو کاك کەریم نەخۆش بووی !

دوکتۆر شوشەیەك حەبی بو دانا گوتی درەنگە دەبێ بچمەوە دەکرێ تکات لێ بکەم دوو روژ لێرە بی ، ئەو کچە بە دیتنی تۆ رەنگی گۆڕا مانەوەی تۆ یارمەتی دەدا ٠ سەدتەمەنیان دا بە دوکتۆر هەر بەو شەوە گەڕاوە٠ من لەوێ بەجێ مام ، تا شەو درەنگانێك لە کن گوڵی دانیشتبووم کاخدر لە پەنای ئێمە دانیشتبوو زۆر بە پەرۆشەوە بوو بۆ کچەکەی ٠ رۆژی دوایی دەبوایە بگەڕێمەوە بۆ شار بای بەگم پوری گوڵی ئاواتێکی هەبوو بە هەموو جۆر دەینواند٠گوڵی لە ئامی بردبوە دەرو نەخۆشی کردبوە بیانو کە لە پەنای دانیشم٠ منیش لە لایەك تازە ژنم هێنابوو کە زۆرم خۆش دەویست ، لە لایەکی تر لە فیکری ژیان و بەڕێ چوونی خۆم دا بووم ٠

پاش دوو رۆژ گوڵی هەستاوە لە نێو ماڵ دا دەهات و دەچوو٠ ولاخیان بۆ من ساز کرد ماڵ ئاوایم لە هەموان کرد سوار بووم و گەڕامەوە ٠ بە داخەوە ئیتر ماڵە کاخدریم نەدیتەوە ٠

ماوەیەك پێ چووبوو رۆژێك لە ماڵە برادەرێك میوان بوم ، خوشکەزاکەم هات گوتی : وەرە وە میوانمان هاتووە" ٠ کە چوومەوە تەماشام کرد بای بەگم لە ماڵێ دانیشتووە ٠ زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنم کرد دایکم و خێزانم زۆر بەرێزەوە لە گەڵی دەدوان ، نان و چێشتیان ساز کردبوو٠ گوتی نەخۆش بووم ٠ هاتبوومە لای دوکتۆر ، گوتم با سەرێکی دایکت بدەم٠ گوتم کارێکی زۆر باشت کردوە٠ بەلام وا دیارە ئێوە هەتانەخۆش نەبن کەستان وەبیر نایەتەوە

گوتی : " تۆ هەر دەنگێ مەکە ئاهی نەخۆشان داخوا تووشی چ بەلایەکت بکا " بای بەگم لای ئێواری رۆیشتەوە، دیداری ئاخریمان بوو ٠

## کارم بـــــۆ پەیدا بـــــوو

بێکاری لە شار دەردێکی گرانە ، بە تایبەت بێکار بی و پارەشت نەبـــێ ٠ ئەگەر کابرایەکی هەژارو نەناسراو لە شار بێکار بێ دەکرێ لە قوژبنێک بـــە حەمبالی و بە هەر سە مەرگێک بێ ژیان بەرێتە سەر ٠ بەلام کابرای ناسراو لە شار بێ و نەداریش بێ ژیانی بۆ تال و دژوارە٠

ژیانی من لە مەهاباد تال بوو بێکار بووم ، نەم دەتوانی لە شار وەدەر کـەوم رۆژێک کاک عەزیزی یوسفی هات و گوتی : " پێم خوشە لە گەل چەند برادەر کۆ بوونەوەمان هەبێ " رۆژی کۆبوونەوەمان دیاری کرد ٠ کاک عەزیز ، هاشمـــی وسین زادە ، رەشەی قاچاخچی ، چوکەلی گەوهەری لە گەل کورێکی دیکە کـــە کاری شوشە بڕی بوو، هاتن ٠ کاک عەزیز گوتی پێویستـە کۆمیتەیەکی شـــار پێک بێنین ئەو برادەرانە هاوکارت دەبن تۆش بەر پرسی کۆمیتە وەئەستۆی خۆ بگری ٠ گوتم : " من تازە لە زیندان هاتوومە دەر پێویستە بزانم وەزعی حیـزب چۆنە ؟ ئێستا کۆمیتەی بەرێوە بەری کێن و لە کوێن ؟پێوەندی لە گـــەل حیزبی تودە چۆنە ؟ بەرنامەی کاری سیاسی و تەشکیلاتیمان چیە ؟ بەشـــی زۆری کادرەکان کە لە زیندان هاتوونە دەر تعنەفور نامەیان نووسیوە وەزعـــی ئەوانە روون کراوەتەوە یان نا ؟ کاک عەزیز گوتی پرسیارەکان هەموو بەجێــن یاداشتنیان دەکەم لە گەل برادەران ئەگەر چاوم پێیان یکەوێ باسیان دەکەین بێگومان تۆش لەو چاو پێکەوتنە دا بەشدار دەبی ٠ ئێستا وەزع زۆر باش نیـە رەحمان و عەولای ئیسحاقی لە دەرەوە دەمیان تێک ناوە ، بەلام خۆ ناکـــرێ تێکۆشان رابگیرێ پێویستە تۆ کارو باری شاری بەرێوە بەری ٠

پاش هێندی باس و وتو ویژ بریار درا وەک بەر پرسی کۆمیتەی شـــار

لە گەڵ ئەو ئەندامانەی خۆم دیارییان دەکەم تێکۆشانی حیزبی دەست پێ بکەین • چەند ڕۆژ پێ چوو کاك حەمەدی سەروکانی " **کاپیتان قادری** " هاتە لام لە وەزعی تێکۆشانی حیزب و بێ بەرنامەیی گلەیی هەبوو • دەیگوت تەنیا ئەسعەدی خودایاری هاتوو چووی ناوچەی ئێمە دەکا ئەویش هەر وەك کادرە۔ کانی دیکە بێ بەرنامە بووە • پێشنیاری دەکرد کە کۆنفرانسێکی حیزبی بگیرێ و لەو کۆنفرانسەدا وەزعی ڕێبەرایەتی و بەرنامەو تاکتیکی حیزب دیاری بکرێ • کاك سەعدەی برای سەعیدئاغای قوپی کە یەکێك لە ئەندامە تێکۆشەرەکانی ناوچە بوو لە گەڵ یەك دوو برادەری شامات و شارویران پەیدا بوون پاش قسەو باسێکی زۆر داوایان دەکرد کە کۆنفرانسی حیزبی بگیرێ ولەو بێ بەرنامەیی و بێ سەرو بەرەیی ڕزگار بین • بڕیارمان دا کە من لە گەڵ کادرەکانی دەرەوە پێوەندی بگرم و ویستی برادەران ڕا بگەیێنم•

بەهاری ١٣٣٧ ـ ١٩٥٨ سەید عەوڵای ئیسحاقی نامەیەکی بۆ نووسیم و داوای کردبوو بچم لە دەورو بەری سیاقوڵ لە شاخی چاوم پێ بکەوێ • ئێوارەیەك کەوتمە ڕێ و پاش پێنج ساڵ لە چیاکانی نێزیك سیاقوڵ چاومان بە یەکتر کەوتەوە • لە سەر وەزعی حیزب و بەرنامەو کۆنفرانس قسەمان کرد• گوتی شتێکمان بە ناوی کۆنفرانس هەبووە بەڵام هیچ بەرنامەیەکمان دا نەناوە لە قسەکانی بۆم دەرکەوت کە لە نێوان ئەو چەند کەسەی کۆمیتەدا ناکۆکی زۆر هەیە کاتێك وەزعی ڕەحمانی قاسملۆم لێ پرسی لە وڵامدا گوتی : ئەو خەریکی کاری خۆیەتی پێوەندی بە حیزبەوە نەماوە، بە فێڵ منی بردبووە ئورووپا کە بە حیزبی تودەم بفرۆشێ •

قەرارمان دانا بە نێوی " **تیکان** " لە گەڵ من پێوەندی بگرێ و نامەم بۆ بنووسێ • گەڕامەوە بۆ شار لە گەڵ چەند برادەرێك کۆمیتەیەکی نەهێنی شاریمان پێکەوە نا •

ڕۆژێك میرزا برایمی حەربی کە لە پێشدا لە لاجان مامۆستا بوو ئەندامێکی حیزب بو دەمناسی لە کار دەرکرابوو هاتە لام و گوتی :

ــ باش نیە تۆ هەروا بێکار بسوڕێیەوە • لە مەیدانی ئاسنگەران دوکانێکم

گرتوه • دوکانێکی خاوێن ، مێزو سەندەڵی لێ دانراوه، وەره ڕۆژێ لەوێ دانیشه ، من و چوکەلیش دەسوڕێینەوه ڕۆژانه شتێك پەیدا دەکەین و بەشی دەکەین • له بێکاری باشتره •

ــ جا به دانیشتن هیچ پەیدا دەبێ ؟

ــ من قاچاخچیەکان دەناسم• ئەگەر مەرکەزێك هەبێ هەموو ڕووی تێ دەکەن • شتەکانیان لێ دەکڕم دراوێکیان بەعێ دەدەمێ ، پاشان دەیفرۆشمەوه، پولەکەی ئەوان دەدەم و قازانجەکەشی بەش دەکەین• تۆ هەر له دوکان دانیشه چای بخۆوەو هیچ مەکه •

من دەمزانی دانیشتن لەو دوکانه له لایەن حکومەتەوه به قاچاخچی دەناسرێم بەڵام هەر کارم به سیاسەت نەبێ هەرچی بیکەم بۆ ئەوان گرنگ نیه• بێجگه لەوه هەرچی بێ له بێکاری و سوڕانەوه باشتره • له گەڵ میرزا برایمی حەربی و چوکەلی گەوهەری کەوتم • ڕۆژانه دەچووم له دوکان دادەنیشتم کڕیاری شتی قاچاخ دەهاتن ، قسەم له گەڵ دەکردن • میرزا برایم و چوکەل شتەکەیان دەبرد دەیان دانێ • شەوی ئەوتۆش هەبوو بارمەتیم دەدان دەچوین له دەورو بەری شار شتی قاچاخمان دەهێناوه • له پەنا ئەوەدا هێندی کۆبونەوەی حیزبیشم بەرێوه دەبرد عەولای ئیسحاقی جارو بار نووسراوەی حیزبی بۆ دەناردم• ڕۆژێك به هۆی " حەمه کەچەلی قاچاخچی دا " نامەیەکی بۆ نوسی بووم • سەید عەولای ڕەحمەتی داوای کردبوو که " کتاب سیاه و سیر کمونیسم در ایران " نووسراوەی بەختیاری سەرۆکی ساواکی بۆ بنێرم • هەر وەها داوای کردبوو هەر کتێبێکی دژی یەکێتی سوڤیەتی نووسرابێ پەیدایان بکەم و بۆیان بنێرم بۆ عیراق • له نامەکەدا نەی نووسیبوو ئەم کتێبانەی بۆ چن و چی یان لێ دەکا • پێم وا بوو که ئەو کتێبانه له عێراق دەدا به باڵوێزخانەی سوڤیەت و نیشانی دەدا که له ئێران بەم چەشنه دژی کۆمونیزم تەبلیغات دەکرێ • چوومه دوکانی ئاغای مرققی کتێبی زۆرم لەو بارەوه کۆ کردەوەو بۆم ناردن • پاشان بۆم دەرکەوت که ئەو کتێبانەیان دژی حیزبی تودەو کومونیزم به گوندەکان دا دەگێڕا •

## دیـان لــه دوکانـــــی بـه تــــالّ

رۆژێك لە دوکانی گۆڕین دانیشتبووم ، کابرایەکی قەرمیمخە هاتــە ژوورو سلاّوی کرد . گوتی لە مەراغەوە هاتووم هێندیّ سابوون و قالیچەو چای عەتریـم دەویّ . حیسابی کرد بایي هەزارو چوارسەد تمەنی دەویست . گوتی لە دەرەوەی شاری مەهاباد تەحویلم بدەن.

گوتم ئەو شتانە هەن، پولێکم بەەی بدەیە شەویّ بۆت دێنین . ٤٠٠ تمەن پولـــی هێنا دەرو بژاردي و لیّم وەرگرت . گوتی رەسیدم بدەیە . لە گەڵ کو باســـــی رەسیدي کرد ، بە دلّم دا هات کە دەبیّ پیاوی کومرگ یا روکنی ۲ بی .

ـ مالّی قاچاخ رەسیدي ناویّ . ئەگەر باوەڕ ناکەی فەرموو پارەکەت وەرگـــرەوە پارەکەی وەرنەگرتەوە ، وەدەر کەوت .

رۆژی پێشتر میرزا خانەی موشیری کە حیسابداری دارایي مەهاباد بــوو، هاتبوو هێندێك سابوون و چای عەتری بۆ دوکانی یوسفی برای لە میرزا برایم کڕیبوو . چەمەدانێکی هێنا بوو لە دوکانەکە دانابوو کە شتەکانی بۆ تێبنیّ . بەلاّم سەوداکە هەر قسە بوو . میرزا برایم رۆژی دەسەودای بە قسەی دەکرد کـــە هیچ لە گۆڕیّدا نەبوو .

میرزا خانە هات گوتی : شتەکانیان نەهێناوە کە وابوو چەمەدانەکــــــەم دەبەمەوە . دەستی دا چەمەدان و وەدەر کەوت . تەمەس کابرای هاتبوو شت لــە ئێمە بکڕیّ گروبانی گومرگ بووە . دە دوازدە سەربازی گومرگی هێناون بـــەو خەیالّە کە دوکان پڕە لە مالّی قاچاخ . لە دەورو بەری دوکان رای گرتبوون کـــە لە کاتی خۆیدا دوکان پەلامار بدەن.

کاتێك میرزا خانەی موشیری چەمەدانی بەتالّی دەس دایەو لە دوکانی وەدەر کەوت ، سەربازەکانی گومرگ بەو خەیالّە کە چەمەدان پڕە لە مالّی قاچــاخ تاویان دایە . هاواری کرد من حیسابداری دارایم فایدەی نەبوو . داگژانــــیّ و جا وەرە لێدە . بە دوازدە سەرباز لێیان دەدا و هاواری دەکرد . من بە گورجـــی دەرپەڕیم و رام کردەوە بۆ مالّ . هێندیّ نووسراوەو بەیان نامەی حیزبیم لــــە

مالێ بوون ، دەستم دانێ و ڕام کرد بۆ ماڵی ئاغای " تەوحیدی " لە دەرگام دا ، ئەفسەر خانم لە پەنجەرەوە گوتی ئەوە دێمە خوار · دەرگای کردەوە پارەکەو نووسراوەکانم دایە گوتم بۆم ڕاگرە ، دێن ماڵم دەگەڕێن ·

بیرم کردەوە لەوانەیە بێنە ماڵێ و ئەگەر لە ماڵێ بم تووشی کێشە دەبم· ڕۆیشتم بەلام بچمە کوێ؟ وام بە باش زانی بچمە ماڵە " فەتاح سمێل " ·ئەو کابرایە لە گەڵ ڕوکنی ٢ هاوکاری دەکرد دەیان گوت جاسوسی ساواکە·بەلام ئەگەر تووشی من دەبوو بە گەرمی سلاوی لێ دەکردم، پێم وا نەبوو خراپەم لە گەڵ دەکا · کە دەرگای کردەوە زۆر بە خۆشی بەخێرهاتنی کردم و چووینە ژوورێ· تازە دانیشتبووم میرزا برایمی حەربی و چوکەلیش وەژوور کەوتن· ئەوانیش چووبوونەوە بۆ لای دوکان ·کە دەبینن سەرباز دوکانیان گەمارۆ داوە دەگەڕێنەوە ئەوانیش ڕاست دێن بۆ ماڵی فەتاح سمێل · شووتی باشی هەبوو دەستمان کرد بە شووتی خواردن پاشان میرزا برایم گوتی : " ئەتو ناناسن پێم خۆشە سەرێکی ماڵی ئێمە بدەی، ترسم هەیە بچن ماڵەکەمان بگەڕێن دایکم فەقیرە دەترسێ ·

هەستام بۆ لای ماڵی میرزا برایم چووم کە گەیشتمە نێزیك ماڵەکەیان سەرباز دەوری ماڵیان دابوو · کابرای گروبان کە پوڵی دابوو بە من لەوێ ڕاوەستابوو · ئیتر دەورمیان دام و کابرا گوتی :

ــ بۆ کوێ ؟ چۆن نەجاتیت دەبێ · کوا پارەکەم بدەوە · تەماشام کرد وەختی کێشە نیە ئەگەر کێشە بکەم تووشی لێدان دەبم و بە خۆڕایی دەچێ ·

گوتم : پارەکەم لە دوکانێك داناوە با بچین وێت دەمەوە · سەربازەکانی بەجێ هێشت و ڕەگەڵم کەوت · بە ئانقەست بردمە پێش ئیدارەی شارەوانی · بە هەڵکەوت سەرۆکی کەلانتەری شارەوانی مەهاباد کە ستوانێکی فارس بێ حەیا و بەرتیل خۆر بوو لە پێش شارەوانی ڕاوەستابوو · کاتێك لە زیندان بووم لە گەڵ ئەو ئەفسەرە بێ نامروە زۆر جار هەرامان ببوو، سلاوم کرد گوتی :

ــ چۆنی چ دەکەی ؟ خەریکی چی ؟

ــ لە من مەپرسە لەو کابرایە بپرسە بزانە چی لە گیانی من دەوێ ؟خۆت

دەزانی لە هەموو شتێك خۆم دەپارێزم• ئێستا ئەو کابرایە نازانم کێیە و چی لە من دەوێ ؟
گروبان وەدەنگ هات : " ناکا شاشام لێ بکەی ؟ جەناب سەروان گروبانی گومرگم چووم بزانم چی قاچاخیان هەیە، چوار سەدتمەنم داوەتێ •
گوتم : تۆ غەلەت دەکەی بە من دەڵەی قاچاخچی ،من هیچ پوڵم لە تۆ وەرنەگرتوە و ناشت ناسم • لەو قسانەدا بوین سەرۆکی شارەبانی هات • بانگیان کردینە ژورێ • کابرای گروبان دەستی پێ کرد داوای لە جەناب سەرهەنگ کرد کە پارەکەم لێ بستێنێتەوە •
ــ درۆ دەکا ئەگەر داوای پارەدەکا دادگوستەری هەیە، با بچێ شکایەت بکا •
کابرا بە تەلیفۆن بانگی سەرۆکی گومرگی مەهاباد ی کرد • هێندە پێ نەچوو سەرهەنگێکی مل هوری بێ حەیای کۆنە قازاخ پەیدا بوو• سڵاوی لە سەروکی شارەوانی کردوو گوتی :
ــ ئەوەیە پوڵی ئێمە دەخوا ؟ هەر لە بن داراندا دەیکوژم• جەناب سەرهەنگ بێنە پەروەندەی بۆ ساز کەو بینێرە زیندان • من هیچم نەگوت تا کاغەزیان هێناو نووسەری شارەبانی هاتوو دەستی کرد بە پرسیار :
ــ خۆت بناسێنە ، ناو نیشانی خۆت بنووسە •
دەستم دا قەڵەم و نووسیم :
ــ لەبەر ئەوە کە سەرهەنگی سەرۆکی گومرگی مەهاباد لە کن سەرهەنگی سەرۆکی شارەوانی هەرەشەی لێدان و کوشتنم لێ دەکا ، هەتا دادستانیان بازپورسی دادسرا نەیەنە ئێرە، هیچ وڵام نادەمەوە • هەر وەها دژی سەرهەنگی سەرۆکی گومرگ ئیعلامی جورم دەکەم و داوا دەکەم سزا بدرێ • قەڵەمەکەمدانا • کاتێك سەرهەنگی شارەوانی و گومرگ تەماشایان کرد، ئاگریان گرت :
ــ ئەوە چییە نووسیوتە ؟ وڵامی پرسیارەکان بدەوە •
ــ وڵام هەر ئەوەیە هەتا دادستان نەیە وڵام نادەمەوە • رووم کردە سەرهەنگی شارەوانی و گوتم : زۆر شەرمە بۆ تۆکە بەر پرسی ئەمنیەت و سلامەتی خەڵکی شاری ، ئەفسەرێکی گومرگ هەرەشەی کوشتن لە من دەکا تۆ وەدەنگ

نایەی. من ناچارم ئەو مەسەلەیە لە دادسرا بێتمە گۆرێ . چەند ساڵ لە سەر ئەوە زیندانم کێشاوە کە پێشی ئەو ملهورییە بگیرێ.
سەرهەنگ گوتی : ئەوە هیچ ، ئەو پرسیارو وڵامە دەدرێنین ، پولی ئەو گروبانە چی لێ بێ ؟
ـ من نازانم ئەوە گروبانە یان نا . لەوانەیە درۆ بکا . ئەگەر گروبانە بۆ جلی نیزامی لە بەردا نیە . وا دیارە لە گەل جەناب سەرهەنگ رێك کەوتوون کە شڵتاغ بە خەلك بکەن .
سەرهەنگی گومرگ دەی نەپراند : فەقیرە... ژن و مندالی هەیە... دەبێ ئەو چوارسەد تمەنە لە گیرفانی خۆی بدا .
ـ کەیفی خۆیەتی چۆن ئەو پیلانەتان رێك خستووە ئاواش چوارسەد تمەنەکە پەیدا بکەنەوە بچن شڵتاغ بە کەسێکی دیکە بکەن . من شارەزای ئێوەم.
سەرۆکی شارەوانی کاغەزەکەی وەرگرتوو دراندی گوتی هەستە برۆ .هەستام وەدەر کەوتم چووم میرزا برایم و چوکەلم دیتەوە.
رۆژی دوایی سەعاتی یازدە سەربازێك هات نامەی سەرهەنگی گومرگی بۆ هینابووم لە نامەکەدا نووسیبووی :" تکایە بۆ نان خواردنی نیوەرۆ تەشریف بێنە مالی ئێمە ، چاوە روان دەبم ".
میرزا برایم و چوکەل گوتیان نابێ بچی ، کەلەکێکت بۆ ساز دەکا . گوتم دەچم و نانەکەش دەخۆم . ئێوەی بانگ نەکردووە حەقتانە . نیوەرۆ چوومە مالێ سەرهەنگ نانێکی باشیان ساز کردبوو خانم هات بە گەرمی بەخێرهاتنی کردم جەناب سەرهەنگ بە شێوەی کۆنە قازاخی بە فێل برێکی تەعریف کردم .
پێکەوە ناندان خواردوو پاشان گوتی :
ـ دەزانم تۆ بێکاری . دەولەت زولمی لێ کردوی ، ئەگەر هاوکاری ئێمە بکەی حقوقێکی زۆر باشت دەدەمێ. پێشنیار دەکەم لە ئیدارەی گومرگ بە رەسمی دابمەزرێی .
گوتم جەناب سەرهەنگ چاوە روانی ئەوە نەبووم پێشنیارێکی ئاوا بە من بکەی.من ئینسانێکی سیاسیم ، دژی ئەو دەولەتە خەباتم کردووە، سێ ساڵ لە زیندان

بووم • ئێستا بێم هاوکاری ئەم حکومەتە بکەم • بەڕاستی ئەگەر زانیبام ئەو خەیاڵەت هەیە نەدەهاتم• زۆر سوپاسی خانم دەکەم بۆ نان و چێشتەکەی• وەدەر کەوتم •

ڕۆژێکی میرزا خانەی موشیری هاتە دوکان و گوتی :

ـ فیکرێك بۆ من بکەنەوە • دەیانەوێ چوارسەدتمەنەکە لە من بستێننەوە•

گوتم : جوابیان مەدەوە • تۆ بابی چوارسەدتمەنت وێ کەوتووە •

من چوارسەدتمەنم خوارد • نازانم پاشان چییان بەسەر حیسابداری دارایی خۆیان هێنا !

## ئیستواری ئەرتەشی شاهەنشاهی

رۆژێك لە دوكانی گۆڕین دانیشتبووم ، میرزا برایمی حەربی لە گەڵ ئیستوارێكی سمێڵ فشی ئەرتەشی شاهەنشاهی هاتەوە دوكان. دانیشتن و بانگی كرد چەند چایان هێنا و گوتی : " ئەو ئیستوارە كەمیارداری سوپای مەهابادە ، پیاوێكی زۆر باش و بەشەرەفە ! قسەم لە گەڵ كردوە كەوش و شاڵواری ئەمریكایی كە بە تایبەت بۆ ئەفسەران دێ لە گەڵ پەتوی ئەمریكایی بۆ مان دێنی ئێمەش دەیفرۆشینەوە."

گوتم : ماڵ وێران كەس نەماوە تا ئیستواری ئەرتەش نەبینیەوە . دەست لە ئەرتەشیان هەڵگرە ، بە تایبەت بۆ من مەترسی زۆرە . هەر لێم لە بیانوون ، شتێكی ئەرتەشیمان لێ بگرن من تێدا دەچم .

گوتی : هیچ نیە ، ئەو ئیستوارە زۆر بە شەرەفە شتەكان دەباتەوە ماڵە خۆی ئێمەش دەچین هەم سەری ماڵێ دەدەین هەم شتەكان دێنین .

لە گەڵ ئیستواری ئەرتەش سەودا دەس پێكرا . كەوشی ئەفسەری ئەمریكایی پێ دەفرۆشتین بە پازدە تمەن ، دەماندا وە بە شێست تمەن . شەلواری ئەفسەری ئەمریكایی پێ دەفرۆشتین بە پازدە تمەن دەمان داوە بە شێست تمەن . سێ شەڵوار دەستێك كەواو پاتۆلی كوردی لێ ساز دەبوو . هەر سێكمان كەواو پاتۆلی پارچەی ئەفسەریمان ساز كردبوو كەس لە بەری دا نەبوو ،پەتووی ئەمریكایی بۆ دێناین بە هەرزان زۆر بە گران دەمان فرۆشتەوە بە كورتی پولێكی باشمان لە ئیستوار وەدەست كەوت .

رۆژێك ئیستوار هات دانیشتوو گوتی : هێندێكم فیشەك لێ بكڕن.

ــ باسی فیشەك مەكە هەستە وەدەر كەوە .

ــ فیشەك هیچ بۆ تانگێكم لێ ناكڕن ، بە حوسێن پێتان دەفرۆشم لە سەری مەیدان بەڵەك تەحویلتان دەدەم .

گوتم : هەستە وەدەر كەوە ... تەماتە سەرمان بە فەتەرات بدەی. ئیستوار حارو بار دەهات دەیگوت : خانم لە ماڵە شتەكان لەوێن من كارم هەیە

خۆتان بچن وەریان گرن .
بە میرزا برایم و چوکەلەم گوت : " لام وایە ئیستوار نەخشەیەکمان بــــۆ دەکێشیّ من ئیتر نایەمەوە ئێرە . هەستم دەکرد کە مەعمورەکانی سازمانـــی ئەمنیەت و روکنی ٢ پتر لە جاران دەورەم دەدەن. کەمتر لە مالیّ دەهاتمەدەر. جارو بار لە کۆمیتەی شاری کۆ دەبوینەوەو لە سەر شێوەی پەرە پیّدانی تێکۆشانمان دەکرد . غەنی بلوریانیش تازە لە زیندان هاتبوە دەر وەدەر نەدەکەوت جارو بار بە شەو دەچووم سەرم دەدا . ئەویش لەوانەی لە دەریّ بون زۆر ناڕازی بوو.

ڕۆژێك برادەرێکی ئازەربایجانی بە ناوی " حوسێنی ئەحمەدی " کە بـــە حەوسێن مراغەیي ناسرابوو ، ماوەیەکی زۆر بوو هاتبوە مەهاباد ، ژنی کوردی هێنابوو ، ببوە ئەندامی حیزب و کوڕێکی بە کارو تێکۆشەر بو. هاتــە لام و گوتی : " باش نیە تۆ بێکار بی ، من دوکانێکی باشم هەیە وەرە دەبینـــە شەریك . تۆ هەر لە دوکان دانیشەو هیچ مەکە ، قەرزو حیسابی دەفتەر بنوســە من سەرم لە کاسبی دەردەچیّ "

ــ من دەس مایەم نیە چوارسەد تمەنم هەیە ، دوکانی تۆ زۆری تێدایە چـــۆن دەبمە شەریك .

ــ دوکانەکە حیساب دەکەین ، دەس مایەکان دیار دەبن لە قازانجیش شەریـــك دەبین .

تەماشام کرد فیکرێکی خراپ نیە لە بێکاری نەجاتیم دەبیّ دەتوانم کــاری سیاسیش بە بەرەوە بکەم . بەلاّم حوسێن مراغەیش بێجگە لە هاو دەرد و دلّ سۆزی بۆ من ، قازانجی خۆشی تێدا دیتبو . پاش ئەوەی من چوومە دوکانـــی حوسێن مراغەیي تەواوی گروبان و مەعمورەکانی روکنی ٢ و ساواك بۆ سەوداو شت کڕین رویان کردە دوکانی ئێمە . دەهاتن بزانن چ دەکەم کیّ دێتە لام ، چ دەفرۆشین و ... بێجگە لەوە دۆست و برادەری زۆر لە شارو لە دێهات رویان کردبوە ئەو دوکانە فرۆشی چەند هێندی جاران بوو.

ئەوەی لەم دوکانە دیتم بۆ من شتێکی سەرسوڕ هێنەر بو . خاسیەتـــــــی

ورده بۆرژوازی و شێوەی پارە پەیداکردن پتر بۆ من روون دەبۆوە ۰ من تەنیا دەفتەرو حیسابی قەرزەکانم دەنووسی ۰ هەمو شتێکی بە قەرز دەدا بە مەعمورەکانی روکنی ۲ ، ستادی ئەرتەش و ساواك ۰ سەری مانگ پارەکەی لێ دەسانـدن لێیان نەدەترسا ، زۆر ئازایانە پارەکەی دەستاند ۰ بەڵام خوا هەڵ ناگرێ ئەگەر سەد تمەنی لە سەر یەکێك دەنووسی ، هەر بایی شێست تمەنی دابوێی ۰لە ماست و رۆن و قەندو چاو میوەو هەرچی شتی کێشان بایە بێ قسە کەمتری بۆ دەکێشان لە جیاتی دو کیلۆ کیلۆ ونیوێکی دەدانێ ۰ زۆر جار پێم دەگوت : وسێن ئاغا ئەوە کارێکی باش نیە ، کەمیان مەدەیە بە گران پێیان دەفروشی قەی ناکە بەڵام کەم کێشان دەبێتە دزی ، دەیکێشنەوە دێنە سەرمان کارێکی جوان نیە۰

ـ تۆ حەقت نەبێ دەفتەرەکە بنووسە ،سەگ باب بۆ جاسوسی دێتە ئێرە، ئەگەر دەزانی کەمە یا گرانە ، با نەیەتە ئێرە شتم لێ نەکرێ ۰

ئەو ماوەی لە دوکان بوم سەرلەشکر وەرمەرام دو جار لە دوای ناردم ، دەستی دەکرد بە هەرەشە : ئاگام لێیە دەزانم چ دەکەی ۰۰ دەزانم کێ هاتوو چـوت دەکا ۰۰ لەو قسە قۆرانە ۰

ئەفسەرانی ساواك دەهاتن شتیان دەکڕی دەیانزانی شتەکە گرانە هەرەشەیان دەکرد : " رۆژێك دەکەویە بەر دەستمان " ۰

رۆژی ۲۳ی پوشپەڕ " چاردەی ژوئیەی ١٩٥٨ " لە ماڵی برادەرێکی دێهاتی کە تازە هاتبوە شار کۆبوونەوەیەکی حیزبیمان هەبوو لە تارانەوە خەبەریان دابوو کە برادەرێك بنێرینە تاران کاك عەزیز و رەحمەتی شەریعەتی لـە تاران بوون ۰ سەید عەوڵای ئیسحاقی نامەی بۆ من نووسیبوو :"ئەگەر بوکاری حیزبی پارەت پێویست بوو بە محی‌الدین ئاغای بابان زادە بڵێ ۰۰ ۰ هاورێی خۆمانە بڕوای پێبکە ، رام ئەسپاردوە تەنیا لە گەڵ تۆ پێوەندی هەبێ "۰

محی‌الدین ئاغا زۆر دەهاتە دوکان و ئەحوال پرسی دەکرد۰ جارێك سەدتمەنم لێ وەرگرت بۆ برادەرێکی کە کادری دێهات بوو۰ جارێکیش هات داوای لێ کردم کە چەند ئەندامی حیزبی بنێرم بۆ کێشەی موڵکی شاهیدی بە درۆی بۆ بدەن ۰ خستمە پشت گۆیان ۰ لە کۆبوونەوەدا باسی محی‌الدین ئاغا

هاته گۆڕێ • یەك دووکەس لە ئەندامانی کۆمیتەی شار گوتیان محی‌الدین ئاغا سالی ۱۳۳۲ لەشکری کردەو بە هاواری دەرەبەگەکانی ناوچەی بۆکانەوە چووە چەند جوتیاری کوشتوە ، ئێستا چۆن بۆتە هاوڕێ حیزبی • داوایان کرد نامە بۆ برادەران بنووسم ئەو مەسەلەیە روون کەمەوە • سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ بوو رادیۆ موسکومان کردەوە گوێمان لە خەبەر بێ هەوەل خەبەری گوتی : " رێبەرانی پەیمانی بەغدا بۆ پێشوازی لە پاشای عێراق لە فرۆکەخانەی ئەستەنبوڵ کۆ ببونەوە، بەلام ئەوندهات بۆ هەمیشەش هەر نەهات• لە عێراق شۆڕشی نیزامی کرا سەرهەنگ عبدالکریم قاسم رێبەری شورش کارو باری وڵاتی گرتە دەست • کردمان بە خۆشی و چەپلە لێدان• لەو کاتەدا خوشکەزاکەی من هاتە ئەو مالـە گوتی : خالە مزگێنیم دەیە کوڕێکمان بووە•

دوو خەبەری خۆش لە کات و سەعاتێك دا هەر لەوێ برادەران بڕیاریان دا ناوی لێ بنێن،لەو کاتەدا لە لوبنان شەڕ بوو، لەشکری ئەمریکا هاتبـووە رۆخەکانی لوبنان و یارمەتی بە کامیل شەمعون دەکرد • کەمال جونبـەلات رێبەری هێزەکانی دژی ئیمپریالیستی و کۆنە پەرستی بەربەرەکانی دەکـرد• بڕیاریان دا کوڕەکەی من بە ناو کەمال جونبەلات بکەن کە ناویان نا کەمـال• لە کۆبونەوە هاتمە دەر چوومە حەساری شارەوانی دەستە گولێکی زۆرجوانـم لە ئەفسەری کێشك وەرگرت و چومەوە مالـێ ، دایکم بە پیرمەوە هات ماچـی کردم ، مزگێنی کوڕی دامێ ، منیش مزگێنی شۆڕشی عێراقم دایە•

لە پێش شۆڕشی عێراقدا ناوی جەمال عبدالناصر لە جیهاندا بلاو ببۆوە • میللی کردنی کانالی سوئز، پەلاماری سێ قۆلی ئیسرائیل و ئینگلیـس و فەرانسە بۆ سەر میسر، دیفاعی خەلکی میسر لە پۆرتی سەعید ، خەلکـی وەخەبەر هێنابوو، باسی رۆژانەی خەلك هەر شەڕی میسرو جەمال‌عبدالناصر بو• ئولتیماتومی یەکێتی سۆڤیێتی بە دەولەتانی پەلاماردان لە دلی خەلکدا هیواو هومێدی پێك هێنابوو• بێجگە لەوە لە قاهیرە رادیۆی کوردی کرابۆوە،خەلـك بە تامەزرۆیی بە دزی گوێیان بۆ رادەگرت ، خەبەرەکانیان بۆ یەکتر دەگێراوە •

لە دوکانی ئێمە هەموو رۆژێ ئێواران وسێن‌ئاغا لە بەر دەرکی دوکـان

رادەوەستا ، من لە ژوریّ رادیۆم دەگرت و گویّم دەدا دەنگ و باس • ئەگـــەر مەعموریّکی ساواك لە دورەوە بۆ لای دوکان دەهات وسیّن ئاغا دەیگوت :خالـّـم دیّ، من رادیۆم بیّ دەنگ دەکرد یا دەمکرد بە تاران •

پاش شۆڕشی عیّراق خەلّك لە چایي خانەکان رادیۆی بەغدایان دەکردەوە ، دەنگ و باسی بەشی کوردی پیّشوازی گەرمی لیّ دەکرا • مەعمورەکاني ســــاواکو روکنی ۲ وەك سەگی هار بە نیّو شار وەر دەبوون و رادیۆکانیان بیّ دەنگ دەکـرد بیانویان بە خەلّك دەگرت • ئەو رۆژەی ماموّستا برایم ئەحمەد لە رادیۆی بەغدا قسەی دەکرد نیّو شاری مەهاباد وەك خۆ پیشاندانی لیّ هاتبوو•

لەو سەرو بەندە دا بەیان نامەیەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانمـــــان پیّ گەیشت • پیّش شۆڕشی عیّراق نووسرابوو• لە ژیّر تەئسیری رادیۆی قاهیرەدا لە بەیان نامەکەدا گوترابوو : " بۆرژوازی عەرەب کەوتۆتە سەر ناسینی مافـی نەتەوایەتی کورد "•

ئیّمە لە مەهاباد بلاّو بوونەوەی ئەو بەیان نامەیەمان بە کاریّکی گرنگ داناو بە هەراوی بلاّومان کردەوە • پاشان دەرکەوت بە تەنیا سەید عەولاّی ئیسحاقـــی ئەو شتەی نووسیووەو نیّوەرۆکیّکی زانستی نیە • چونکە بۆرژوازی عەرەب یان فارس و تورك ئەوەنین کە مافی نەتەوایەتی کورد بناسن •

چەند رۆژ دوای شۆڕشی عیّراق لە روکنی ۲ هاتن بردیانم بۆ لای وەرەهرام • دوو سیّ قوتابی پۆلی نیّوەنجیشیان هیّنابوو یەکیّکیان جولەکە بوو• کە چوینـە ژور،وەرەهرام روی لە من کردوو گوتی : " پیّت وا نەبیّ زەمانی سمایل ئاغایەو بە تفەنگی سیّتیر دەتوانن ولاّت بشیّوێنن.دەستور دەدەم لە ورمیّ وەهەتـــــا سەردەشت بۆمبارانی بکەن ئەو فیکرانە لە سەری خۆتان بەرنە دەر •

ــ تیمســار زۆرم پیّ سەیرە ، نازانم باسی چ دەکەی ئەو شتانە چ پیّوەندیەکیـــان بەمنەوە هەیە • بۆ چی باسی سمایل ئاغاو بۆمباران لە گەلّ من دیّنیە گۆڕیّ ؟ کەیفی خۆتە دەستور بدە بۆمباران بکریّ ، بەلاّم هیچ میللەتیّك بە بۆمباران لە بەین ناچیّ •

ــ دەزانم فیکرتان چیە ، ئاگام لە هەموو کاریّکتان هەیە • پاشان روی کـــــردە

برا دەرە جولەکەکەو بە بێ شەرمی گوتی :
ـ هەتیوە حیزە تۆ دەڵێی چی ؟ پێت وایە نازانم چ دەکەی ، لە گەڵ کێ دەگەڕێی بڕۆن وەدەر کەون ٠
قسەکانی وەرەحرام و بانگەکردنی ئێمە نیشانی دەدا کە ترسێکی زۆریان هەیەو لایان وایە کە حیزبی دیموکرات هێزەو دەتوانێ شتێك بکا ٠ لەو بەینەدا یوسفی ڕێزوانیش پاش پێنج ساڵ حەپس ئازاد کرابوو ٠ هەرکە گەیشتەوە مەهاباد بە نووسین پێی ڕاگەیاندم کە ئامادەیە هاوکاری بکاو دەست لە تێکۆشان هەڵ ناگرێ ٠ بێکاری و نەداری ئەویش سەربارێك بوو ٠ زۆرمان هەوڵ دا کارێکی بۆ پەیدا بکەین فایدەی نەبوو ٠ ڕۆژێك تووشی جەعفەر ئاغای کەریمی بوم ٠ بەو زمانە لوسەی کە هەیبو ٠ سلاوی کردو گوتی : " قوربان بۆ هەموو خزمەتێك ئامادەم" ٠ پێم گوت : تکایەکم هەیە ، یوسفی ڕێزوانی بێکارە لە کورە خانە بیکە سەر پاڵە حقوقێکی باشی بدەیە با لە پێش چاوان وون بێ ٠
ـ بە چاوان ٠٠٠ بە چاوان ئەو ڕۆژانە پێت دەڵێمەوە ٠
بەخوا ئێستاش پێی نەگوتمەوە و بەڵێنیەکەی نەبردە سەر ٠ یوسف هات لە پەنا دوکانەکەی ئێمە کەوەرو پیوازی دەفرۆشت ٠ لە کاتێکدا ئامۆزایەکی بابی یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی هەرە گەورەی مەهاباد بوو ٠

## گەزی ئیسفەهان و ئەفسەری ئەمریکایی

پاش ڕوخانی حکومەتی دوکتۆر مصدق ئەرتەشی ئێران بە کردەوە کەوتە بەر دەستی ئەفسەرانی ئەمریکایی ٠ کوردستان کرا بە پێگەی نیزامی بۆ دروست کردنی پێگە نیزامیەکانی خانێ و جەڵدیان پڕ ببوو لە ئەفسەرو گروپانی ئەمریکایی ٠
ڕۆژێك ئەفسەرێکی ئەمریکایی لە گەڵ ستوانێکی ئەرتەشی ئێران کە وەك وەرگێڕ لە گەڵی بووهاتە دوکان داوای گەزی ئیسفەهانی کرد ٠ منیش قوتویەکم دایەو پارەم لێ وەرگرت ٠ کابرا پاش دو سەعات هاتەوە گوتی : " ئەم گەزە

خەراپە ... نامەوێ پارەکەم بدەوە "٠

ــ من دروستم نەکردوە قوتوەکە سەری نەکراوەتەوە پولەکەش نادەمەوە ٠ کابرا چەقەیەکی زۆری کرد پێم گوت : " ئێوە لە خەڵکی ئێران دو ئەوەندەی ئەفسەری ئێرانی حقوق وەردەگرن ، ئێستا هاتوی بۆ پارەی قوتوە گەزێك کێشەی دەکەی "٠ ئەفسەری ئێرانی کە وەرگێڕ بو دیار بو قسەکانی منی پێ خوش بوو٠ بە ئینگلیزی بۆی دەگێڕاوە ٠ گوتی: " بیدەیەوە باشە دەترسم توشی کێشەت بکا سنای دەمەوە ٠ با بچێ شکایەت بکا ٠ ئاژانێك بەوێ دا هات ئەفسەری ئەمریکایی بانگی کردو گوتی : " ئەو دوکاندارە گەزی خراپی بە من فرۆشتوە پارەکەم ناداتەوە ٠

کابرای ئاژان منی دەناسی پێش ئەوە وەدەنگ بێ پێم گوت : تۆ خۆت پیاو خراپ مەکە با بچێ لە شارەوانی شکایەت بکا ٠ ئاژانەکە گوتی : "شارەوانی نێزیکە بچۆ لەوێ شکایەت بکە ٠

هێندێ خەڵك لە دەوری دوکانەکە کۆ ببونەوە دەرفەت بو کە لە سەر ئەفسەرانی ئەمریکایی لە ئێران دا قسە بکەم ٠ کابرای ئەمریکایی رۆیشت و چوە شارەوانی پاسەوانێك هات گوتی :" رەئیسی شارەوانی بانگت دەکا ٠کاتێك چوم سەرهەنگی شارەوانی گوتی :

ــ ئاغای حیسامی تۆ هەمیشە لە کێشە دەگەڕێ ٠ پارەی گەزێك هیچ نیە بیدەوە ٠

ــ جەناب سەرهەنگ پێم خۆشە لەو ئەمریکایە بپرسی : لە پولی خەڵکی ئێران چەند حقوق وەردەگرێ ؟ حقوقی تۆ کە سەرهەنگی لە گەڵ حقوقی ئەو رەنگە گروبان بێ چەندی فەرق هەیە ٠

سەرهەنگ رەنگی پەڕی گوتی وەختی ئەم قسانە نیە هەستە بڕۆ من پارەکەی دەدەمەوە ٠

وەدەر کەوتم خەڵك پتر لە بەرامبەر شارەوانی راوەستابون بزانن بۆ چی منیان بردۆتە شارەوانی و چم لێ دەکەن ٠ کێشەی من لە گەڵ ئەفسەری ئەمریکایی چەند رۆژ ببوە جێگای قسەو باسی خەڵك ٠

نەخۆشی دایکم دەهات توندتر دەبوو مەترسی ئەوە هەبوو منداڵەکەمان و

خێزانم و خوشکە زاکەم تووشی نەخۆشی سیل بن • دوکتۆر هیروئابادی هەمیشە دەیگوت هەوڵبدە دایکت بنێرە بۆ تاران ترسی ئەوە هەیە منداڵەکان هەموو نەخۆش بن • نامەیەکی دیکەم بۆ وەرەهرام نووسی ، داوام کرد کە ئیجازە بدا دایکم بەرمە تاران و لە خەستەخانەی شائاباد بیخەوێنم • لە داوێنی نامەکەی لە وڵامدا نووسیبوی : " حەقی نیە لە مەهاباد وەدەر کەوێ •

لەو بەینە دا ئەو برادەرانەی بە ناوی بەر پرسی حیزبی لە تاران بوون بڕیاریان دابوو کە عەولای ئیسحاقی بێتەوە ئێران و لە ناوچەی سنە کار بکا عەزیزی یوسفی بچێتە عێراق و نوێنەری حیزب بێ • عەزیز لە تارانەوە دێتە ورمێ ، لەوێ سواری لۆریە دەبێ کە بێتەوە ناوچەی مەهاباد و بڕوا بۆ کوردستانی عێراق لە گوندی با لانیش ژاندارمە پێشی لۆری دەگرن و کاک عەزیزی یوسفی دێننە خوارێ و دەیگرن • ئێمە لە مەهاباد نەمان زانی کە عەزیز گیراوە • رۆژێك سا لاری زادە رەئیسی روکنی ٢ قادری یوسفی برای کاك عەزیز بانگ دەکاو لێی دەپرسێ :

ـ عەزیز لە کوێیە ؟ قادر دەڵێ : نازانم بیستوومە لە تاران شاگرد خەیاتە

ـ نەخێر لە تاران شاگردخەیات نیە ئێستا لە زیندانە •

قادر هاتە لای من گوتی عەزیز گیراوە لە با لانیش گرتویانە بردویانە بۆ تاران خەبەرێکی ناخۆش بو ، ترسی ئەوەش هەبو لە مەهاباد ئێمەش بگرن • بڕیارمان دا ئەوانەی ناسراون کەمتر هاتوو چۆوی یەکتر بکەن ، لە بازاڕو لە شەقام لە گەڵ خەلکی دیکەو لە گەڵ یەکتر رانەوەستن •

مانگی رەزبەر بوو ، ئێوارەیەك خوشکە زاکەم هاتە دوکان و گوتی : " دوو پاسەوان هاتون دەڵێن ماڵەکەتان دەگەڕێین • " راست چوومە لای دادستان نامە- یەکم دایە و نووسیبوم : دوو پاسەوان بە بێ ئیجازەی دادسرا چوونە ماڵی من و منداڵیان ترساندون ، داوا دەکەم نوێنەری دادستان بێت و بزانێ ئەو پاسەوانانە لە ماڵی من چ دەکەن ؟ دادستانی تەلیفونی کرد بۆ دادیار و چوم دادیارم هەڵگرتوو چوومەوە ماڵێ • کە چوین رەحمانی رەسو زۆرە لە گەڵ عەلی رەبیعی کە هەر دووکیان پاسەوان بون بە چەکەوە لە حەسارێ راوەستابون

دادیار هەر دووکی وەپێش خۆ دان بۆ شارەوانی لەوێ ئەمری گرتنی هەر دووکا ـ نی نووسی · چەکیان لێ کردنەوەو لە زیندانیان کردن · بەیانی سەرۆکی شارەوانی بانگی کردم و گوتی : " ئەوانە فەقیرن ، ئەگەر لێیان خۆش نەبی نەك هەر لە شارەوانی دەردەکرێن ، بەڵکو بە حەبسیش مەحکوم دەبن·

ـ ناتوانم لێیان خۆش بم یەکەم کاری بێ قانونیان کردوە بێ ئیجازەی دادسرا چوونە ماڵی من ، دووهەم منداڵیان ترساندوە، سێهەم لە گەرەك منیان بە قاچاخچی ناساندوە ، دەبێ بە گوێرەی قانون سزا بدرێن ·

کەس و کاریان دەستیان کرد بە هات و چوو پارانەوە· بەڵام بریارم دا لێیان خۆش نەبم · بە تایبەت عەلی رەبیعی کە لە زیندان لە سەر برایەکی دێهاتی لە گەڵی بە شەر هاتبوم · ویستبوی تۆڵەی ئەو شەرە بکاتەوە· ماوەیەك پێ چوو لە زیندان دا بون · شەوێك کاك محەمەدی مامڵێ لە پرا وەژور کەوت ·پاش چاخواردنەوە گوتی : هاتووم هەتا نامەی لێ خوش بونی رەحمانی رەسو زورەی نەنووسی لەو ماڵە ناچمە دەر · دایك و بابی هاتوونە ماڵی من و ئێستا لەوێ دانیشتون ·من محەمەدی مامڵێ وەك هونەرمەندێکی مەزنی کوردو مروڤێکی بە شەخسیەت هەمیشە خۆشم ویستوە· هەر دەست بەجێ نامەیەکم نووسی و لە رەحمانی خوش بووم و داوام کرد ئازادی بکەن · لام وایە کاك محەمەد بە مەمنونی بە خۆشی گەراوە · بەیانی رەحمانی رەسو زورە ئازاد کرا ، هاتە دوکان و عوزری هێناوە گوتی : عەلی رەبیعی توشی ئەو هەڵەی کردم · رەبیعی لە زیندان دا مابۆوە، نەمزانی چی بە سەر هاتوو کەنگێ ئازاد کرا·چونکە ئیتر من لە ئێراندا نەمام ·

## دەربەدەری و دووری لـە نیشتمـــــان

ڕۆژی ۱۹ ای سەرماوەزی ۱۳۳۷ ـ ۱۹۵۸/۱۲/۱۰ بەیانی تازە دەگەیشتمەدوکان دوو گروبانی روکنی ۲ گەیشتنە بەر دەرگا گوتیان فەرمو لە روکنی ۲ داوا ت دەکەن • وەپێش خۆیان دام و لە روکنی ۲ سەرهەنگ سالاری زادە وەپێشم کـەوت بۆ دەفتەری سوپا کە سەر لەشکر وەرەهرام لەوێدا دادەنیشت • بۆ خۆی چـوە ژوورو منیان لە دەرەوە را گرت • پاش چەند دەقیقە بردیانمە ژوور • وەرەهرام سەری هەڵێنا و گوتی : " دایکت هەر نەخۆشە ؟ خەتای خۆتە، پێم گوتی هەدادە ئێستا ڕۆژی شەموو ۲۱ ی سەرماوەز کە ڕۆژی ئازادی ئازربایجانە لە مەهاباد لەشکر ڕێژە دەڕوا• لەو میتنگە دا کە بەم بۆنەوە ساز دەگرێ دەبێ بـێ دژی حکومەتە پوشالیەکانی ئازربایجان و کوردستان ، دژی جمهوری عێراق ، دژی مەلامستەفای بارزانی، وە دژی حیزبی تودە قسە بکەی • پاشان بچی لە رادیـۆی مەهاباد قسەکانت دوپاتە بکەیەوە • ئەودەم ڕێگا دەدەم دایکت بەریە تاران• هەر ئێستا بە سەرۆکی شێرو خورشید دەڵێم بۆ خەرجی ڕێگا سەدتمەنت بداتێ دەتوانی بچی وەریگری کە لە تاران هاتیەوە لە فەرمانداری مەهاباد کــاری باشت پێ دەسپێرم ، بۆخۆت بژی فیکری ئاژاوە لە سەرت بەرە دەرێ• "

گوتم : تیمسار من دەستم لە سیاسەت هەڵگرتوە ئێستا ئەوە لە دوکانێك کاسبی دەکەم• ئێوە تەنانەت ڕێگا نادەن نەخۆشێکی کە لە سەرە مەرگدایە بــۆ خەستەخانەی بەرم• لە قانونی هیچ دەوڵەتێکدا ڕێگای چونی نەخۆش بۆ خەستە ـ خانە ناگیرێ • من کارم بە سیاسەت نەماوە لە رادیۆ و لە میتینگدا ناتوانـم قسە بکەم•

گوتـی : " باسی قانون دەکەی ••• ریدم تو قانون (واتا گوم کرد لە قانون)ئێوە بە قانون شای ئێمەتان راو نا ؟ لەو قسانە گەڕێ ، هەر ئێستا دەت نێرم بـۆ سەربازخانە و هەتا مردن لە تەویلە نایە دەرێ • حالی بوی ؟ مێشکت کار دەکا "

تەماشام کرد وەزعەکە شپرزەیە • ماوەیەك پێش برادەران لە تارانـــەوە خەبەریان دابوو ترسی ئەوە هەیە حیسامی بگرنەوە نابێ بە هیچ جۆر خۆ بــە

دەستەوە بدا • هەرەشەی وەرهەرام و راسپاردەی برادەران تۆزێك وریـــــای کردمەوە • بریارم دا پێویستە بە جۆرێك خۆ دەرباز کەم•
گوتم : زۆر باشە کەنگێ دەفەرمووی دەچم لە رادیۆ قسە دەکەم لە مێتینگیشدا قسە دەکەم •
ــ زۆر باشە ، بچوو وتارەکە بنووسە ، بیهێنە تەماشای کەم• پاشان دەچـــی دەیخوێنیەوە •
ــ تیمسار من خوێندەوارییەکی وام نیە بتوانم مەقالە بنووسم • ئێوە چۆنـــــی دەنووسن من دەیخوێنمەوە•
ــ دەست لەو قسانە هەڵگرە ئەگەر لە زیندان دیفاعی زیندانیەکانت تەماشـــا دەکرد خوێندەوار بوی ، بەڵام ئێستا ناتوانی مەقالە بنووسی• برۆ بینووســـە رۆژی شەموو بەیانی بیهێنە تەماشای بکەم هەر ئێستا بچوو لە شێرو خورشیـــد پارە وەرگرە، رۆژی شەموو دایکت بەرە بۆ تاران • هەر لەوێ تەلیفونی هەڵگرت و بە سەرۆکی شێروخورشیدی گوت : " ئەوە حیسامی دێت سەدتمەن پولی بدەیە نامەی بۆ بنووسە بۆ خەستەخانەی شائاباد کە دایکی رابگرن •
هەموو خوێنم بو بە ئاو ، بریاری خۆم دا ددانم بە جەرگم داگرت گوتم: باشە دەچم وتارەکە دەنووسم ، بەیانی شەموو دەیهێنمە خزمەتت•
ــ برۆ باشە لە تاران گەرایەوە وەرە لام • کارت بۆ دیاری دەکەم •
وەدەرکەوتم • چومەوە دوکان دەس بە جێ بە برادەرانی کۆمیتەم راگەیانـــد سەعاتی چواری دوای نیوەرۆ لە ماڵی وسێن ئاغا کۆ بنەوە • بە دوای مـــن دا غەنی بلوریانیشیان هێنابو بە ئەویشی گوتبو دەبی رۆژی ۲۱ی سەرماوەزلەگەڵ کەریمی حیسامی لە رادیۆ قسە بکەی • ئەویش گوتبوی باشە• چووبوەوە ماڵێ• نیوەرۆ لە ماڵێ دانیشتبوم غەنی لە دوای ناردم گوتبوی شەوێ بێتە ماڵ ئێمە•
عەزیزی فەلاحی کە تازە لە زیندان ئازاد ببو کابرایەکی جنگە نوکە،شەرە فرۆش ، بێ بیرو باوەر لە شەقام بێکار دەسوراوەو قوتە قوتەی دەکرد بانگـــی دەکەن بۆ رۆکنی ۲ دەیگرن ماوەرانیەکان کە خزمی بوون دەچن بۆی دەبن بـــە کەفیل و بەری دەدەن ، کاتێك دەزانێ کە من و غەنی بلوریانیان بانگ کـــردوە

را دەکا و لە شار وەدەر دەکەوێ ·
سەعاتی چوار کۆمیتەی شار کۆبۆوە · چونی لای وەرمەرام و قسەو باسەکەم بۆ گێڕانەوە گوتم : بیری لێ بکەنەوەو بڕیار بدەن· پاش هێندی قسەو باس گوتیان بیرو رای خۆت چیەو چۆن بڕیار دەدەی ؟
ـ خۆم نامەوێ بچم لە رادیۆو لە متینگ قسە بکەم · ئەگەر لە زیندان دا بمرزم ئەو کارە ناکەم· بەڵام پێویستە ئێوەش نەزەر بدەن·
بە تێکرایی سپاسیان کرد گوتیان هەر چاوەڕوانی ئەوەمان لە تۆ دەکرد · بەڵام لەو حاڵەدا ناتوانی لە ئێران خۆ بشاریەوە· پێشنیار دەکەین بچی بۆ عێراق· ئێستا دەرەتانی مانەوە لە عێراق هەیە· شۆڕشی عێراق بۆتە بنکەی ئازادیخوازان ، بێجگە لەوە ئەگەر بچیە عێراق یارمەتی تێکۆشان بە برادەران دەکەی · لە سەر غەنی بلور یان بڕیارمان دا کە نابێ بچێ قسە بکا لە گەڵ من بێت بۆ عێراق · دەبوایە رۆژی جومعە ٢٠ی سەرماوەز لە شار وەدەر کەوم بچمە سیا قول· قاسمی سولتانیان بە ناوی حیزبی " فتاح " لەوێ بوو دەبوایە بەرێم بکا بۆ عێراق · هەر ئەو رۆژە نامەیەکم نووسی بۆ کاك قادری کوری کاخدری دیبوکری ، داوام لێ کرد کە بەیانی ( واتە روژی جومعە ) دەستێك جلی کور دی و دوو وڵاخی سواریم بۆ بنێری دێمە دیبوکر·
من بۆ خۆم جلی کوردی رانکو چۆخەی جوانم هەبوو، جلی کوردیم بۆ غەنی بلوریان دەویست، چونکە دڵنیا بووم کە غەنی ناچێ لە سەر رادیۆ قسە ناکا و لە گەڵ من وەدەر دەکەوێ · شەوێ هەستام چومە ماڵێ غەنی · تەنیا یونسی برای لە کن بو· یونس پێشتر گیرابو ،لە سەر غەنی و چەند برادەرێکی دیکە ئیعترافی کردبوو ، لە گەڵ ساواك نێوانی خۆش بوو · بەو حاڵەش یونس لە لای ئێمە دانیشت· غەنی قسەکانی خۆی لە گەڵ وەرمەرام بۆ گێڕامەوە گوتی :
ـ تەگبیر چیە ، چ بکەین ؟
ـ لە سەر ئەو باوەرەم بچینە عێراق · نابێ بچین لە رادیۆ قسە بکەین· کۆمیتەی شاریش هەر ئەو بڕیارەی داوە کە بڕۆین بچینە عێراق· وەزعی برادەرانی ئێمە لە عێراق شپرزەیە، ئێمە دەتوانین وەزعی حیزبیش رێك و پێك بکەین·

ــ فکرێکی باشە ، ڕێگای دیکەمان نیە • بەڵام با ئەوە شت پێ بڵێم کە حەوانەوە لە گەڵ مەلا مستەفای بارزانی زۆر زەحمەتە• ڕەنگە زیندان باشتر بێ دەی ناسم و دەزانم چیە • بەڵام عیلاجمان نیە • چۆن بڕۆین؟
ــ دوێنێ نامەم نووسیوە لە دیبوکر دوو ئەسپ و جلی کوردیمان بۆ بنێرن• سوار دەبین و دەڕۆین ، من شارەزام پیاوی دیکەش لە گەڵ خۆمان دەبەین•
ــ زۆر باشە بەیانی لە گوێ دەبی بە هاشمی حوسێن زادە دا نامەم بۆ بنێرە دێمە لای تۆ ، ئەگەر ئەسپ و جلی کوردی هاتن دەڕۆین •
شەو گەڕامەوە ماڵێ حیکایەت و مەسەلەی ڕۆیشتنم بۆ دایکم گێڕاوە گوتم "دایە گیان ئێستا باش بیری لێ بکەوە• یان دەبێ بچم لە رادیۆ و لە میتینگدا قسە بکەم و پاشان بە سەر شۆڕی لە نێو شار دا بگەڕێم و لە لای ئێوە بمێنمەوە • یا دەبێ بڕۆم و ئێوە بێ کەس و بێ سەرپەرشت بەجێ بێڵم•ڕەنگە من دەرباز بم ، بەلام نازانم ئێوە چیتان بە سەر دێت •
دایکم بە ئاخێکی ساردو بە کوڵی گریانەوە گوتی : " قەت نابی کاری وا بکەی بچی بۆ عەجەمان قسە بکەی • ئێستا ئێمە بە ناوو بە کردەوەی تۆ سەربەرزین• ئەگەر بچی لە رادیۆ قسە بکەی پاشان لە رووت هەڵنایە لەم شارە دا بژی • ئەتۆ بڕۆ ، خولا بکەم دەرباز بی ئێمە ئەگەر ژیاین ئەوە دەژین و تۆش دەبینینەوە • ئەگەر مردیشین ئەتۆ خۆش بی "•
بە داخەوە دایکم مردو چاوم پێی نەکەوتەوە• ئەو ڕۆژەی لە کن سەرلەشکر وەرەهرام هاتمە دەر، چومە لای حاجی مەلا خالیدی وەحیدی باسەکەم بۆ گێڕاوە • حاجی مەلا دوو سێ دڵۆپە فرمێسکی بە سەر ریشە سپی و نورانیەکەی دا هاتنە خوارێ و گوتی :
ــ باشە ••• ئەدی وەزعی مندالەکانت چی لێ دێ ؟
ــ نازانم ••• مەجبورم بەجێیان بێڵم • ناتوانم بچم لە سەر رادیۆ قسە بکەم و پاشانیش لە شار دا بژیم •
ــ نا ••• نابی کاری وا بکەی ئێستا بۆ عێراق ڕێگا هەیە ، تۆ دەبی بڕۆی بۆ ژیانی منداڵەکانیش خودا کەریمە•

هەر ئەو رۆژە لای ئێواری چوومە لای دوکتۆر هێروئابادی . ئەحواڵی دایکمی پرسی ، مەسەلەکەم بۆ گێڕاوە ، گوتم : دەڕۆم ناچم لە رادیۆ قسە ناکەم،تکایە جارو بار سەرێکی دایکم بدە . گەلێك خەفەت بار داما پاشان پولێکی هێنا دەرێ و گوتی : تکایە ئەو پولە بۆ خەرجی رێگا هەڵگرە. بەگەرمی دەستی یەکترمان گوشی و وەدەر کەوتم . هاتمەوە دوکان بە وسێن ئاغام گوت: "ئێستا بڕیارە دەبێ بڕۆم منداڵەکان بە تۆ دەسپێرم " .

لەو کاتەدا گروبانێکی پیری ژاندارمە هاتە دوکان ئەو کابرایە دۆستی وسێن مراغەیی بوو ، سەودای لێ دەکرد . سلاوی کردو گوتی : "پەنا گیتر میشم" ( واتا پەنام هێناوە ) . وسێن ئاغا گوتی : " سەرگروبان خولا نەکا ، چ بووە.. چ قەوماوە بلێ دوکانی خۆتە ، هەرچی بتەوێ هەیە ، بە حەزرەت عەباس دوکانی خۆتە .

ـ مەسەلە دوکان نیە . مەسەلە ئەوەیە دەمنێرن بۆ سەردەشت ، من قەت نەچومە کوردستان. دەڵێن لەشکری عێراق لە سەر سنوری ئێرانە . لەوانەیە شەڕ ساز بێ منی چارە رەش چ بکەم ژن و منداڵم لێرە دەمێننەوە .

ـ خاتر جەم بە بە منداڵەکان بڵێ هەرچی ویستیان بێنە دوکان ، مەحتەل یان ناکەم ، ئەگەر درەنگ هاتیەوە منداڵەکانت سواری ماشێن دەکەم دەیان نێرمەوە مەراغە . بە حەزرەت عەباس بۆ خۆشم لە گەڵیان دەچم . وسێن ئاغا بە ترکی لە گەل کابرا قسەی دەکرد . بە کوردیش بە منی دەگوت دینی وا لێ دەکەم ئەگەر خولا دەکا شەڕ دەبێ و دەکوژرێ ناهێڵم ژنەکەی بێ ساحەب بێ .

گوتم باشە سەرگروبان خۆ تۆ بە تەنیا نی لەشکری ئێران بە هێزە.

ـ ئەی ئاغا ... هێزی چی ... ئاگات لێ نیە ئەوە حەوتویەکە ئەفسەرەکانی ئەرتەش و ژاندارمە بە شەو ژن و منداڵیان بۆ تەوریز و تاران بەرێ دەکەن.خۆ ماڵیان لێرە نەماوە. خۆیان بۆ هەلاتن ساز دەکەن.

ـ کە وایە تۆش ژن و منداڵەکەت بنێرەوە مراغە .

ـ ناهێڵن... ناهێڵن ئێمە ژن و منداڵمان بەرینەوە. دەڵێن خەڵك پێ دەزانی.

وسێن ئاغا گوتی : سەرگروبان دە خەمی منداڵەکان دا مەبە بۆ خۆم وەك تۆ

چاوم لێیان دەبێ ، ئێستا چت دەوێ ؟
ـ بڵێم چی ... هاتوم ئاغای حیسامی کاغەزێکم بداتی ئەگەر لە سەردەشت شتێك قەوما هەتا دەگەمەوە مەهاباد خۆمی پێ نەجات بدەم، کورد نەم کوژن .
ـ سەرگروبان کاغەزی چی ؟ خۆ من فەرماندە نیم .
ـ هەموو دەڵێن کاغەزی حیسامیت پێ بێ ، کەس دەستت لێ نادا .
ـ کاغەزی ناوێ ... خولای کرد بو بەشەرو ئێوە شکان تۆ گەیشتیە هەر گوندێکی بە کوردەکان بڵێ دەچمە کن حیسامی . دەستت لی نادەن هەر ناوی من بێنی بەسە .
ـ ئەڵڵا عومر ورسن . ئەللا سەنی بزە چوخ گویرماسن .
گروبان رۆیشت . ئێمە لە گەڵ وسێن ئاغا بیرمان لەوە دەکردەوە بن دەستی کێبێن و کێ حوکماتمان لە سەر دەکا ! پولێکم لە وسێن ئاغا وەرگرتوو خودا حافیزیم لێ کردو وەدەر کەوتم.جاسوسی ساواك و روکنی ٢ لە دەورو بەری دوکان دەسوڕانەوە. ئەو شەوە لە ماڵێ خەوم لێ نەکەوت . خێزانم زۆر نارەحەت بو ، دوا روژێکی تاڵ و دژواری دەبینی ، هەتا رۆژ نە نوست نەی هێشت منیش بنوم . ئاگام لێ بو دایکم دەگریا ، بەڵام لە بەر ئەمن دەری نەدەبڕی . لەگەڵ کازێوەی بەیانی هەستام بە بیانوی حەمام هاتمە دەرو راست بە شەقام وڕووم کردە گەرماوی شێروخورشید . نامەیەکم نووسی دام بە خێزانم ببیا بۆ هاشمی حوسێن زادە کە بیدا بە غەنی بلوریان ئەویش بێتە ماڵی چوکەل . لە ماڵێ گوتم : دەچمە ماڵی چوکەلی گەوهەری با خوشکە زاکەم سەعات هەشت حلی کوردیم بۆ بێنێ . گەیشتمە حەمام و بام داوە چومە ماڵە چوکەلی .نان و چای بەیانیمان دەخوارد خوشکەزاکەم هات. ڕانك و چۆخەی بۆ هێنابوم . گوتی : بەیانی هەر پاش وەدەر کەوتنی تۆ دو دژبان هاتون لە تۆیان پرسیوە. گوتومانە شەوێ نەهاتۆتەوە . خوشکە زاکەم ناردەوەو گوتم زوو نامەی هاشمی حوسێنزادە بەرن بیدەنێ.
سەعات بو بە یازدە غەنی پەیدا نەبو. مەلا رەحمانی پیاوی خانمە خانمی بە هەناسە بڕکە وەژور کەوت :

ــ ئەوە بۆ لێرە دانیشتووی ، بە حەقی خودا دەت کوژن • هەرچی گروبـــــان و جاسوسی ساواکی هەیە وەنێو شارکەوتون و لە تۆ دەگەرێن • هەرکەسێکـــی جارێك لە گەڵ تۆیان دیتبێ ، هاتوو چۆت کردبێ ، دەیگرن و لێی دەدەن• بـــۆ خاتری خوا ••• هەستە برۆ ••• بە جۆرێك لە شار وەدەر کەوە•

نەدەکرا چی دیکە چاوە ڕوانی غەنی بم یان راوەستم کە لە دێبوگرەوە و لاخی سواریم بۆ بێ پاش هاتنی مەلا رەحمان و نەهاتنی غەنی بلوریان رانـــك و چۆخەم لەبەر کردو راست رووم کردە سەر بازخانەی شار• فیکرم کردەوە پولیـس نابێ فیکری ئەوە بکا کەسێکی خۆی شاردبێتەوە بچێتە سەربازخانە• بە تایبەت رۆژی هەینی بۆ خەڵکێکی زۆر بۆ سەردانی سەربازان دەچونە سەربازخانە ئـەو شەقامە پڕ لە خەڵك بوو•

کاتێك خێزانم نامە بۆ هاشمی حوسێن زادە دەبا کە بیدا بە غەنی بلوریان و بێتە لای من ، کە دێتە دەر دەبینی گروبان لە من دەگەرێن• لە ترسان دەچێتە حەمام و نایەتە دەر • غەنی لە مالی خۆیان وەدەر دەکەوێ لە مالێکی دیکە خۆ دەشارێتەوە • پاشان دەچێتە نەغەدە مالی وەهابی برای کە هاوکاری ساواك بوو• وەهاب تکای بۆ دەکاو دەس لە غەنی هەڵ دەگرن • پاش رۆیشتنی من ئیتـــــر وازیان لە هاشمی حوسێن زادەو ئی دیکە هێناو شار ئارام ببۆوە •

بە یەك دو کوچەو کولانان دا بام داوەو رووم کردە سەربازخانە بە تەنیشـــــت سەربازخانەدا هەڵکشام و گەیشتمە سەر بستوی نێوان هەمزاوا و پشتەپ

لە سەر زینوێ توشی کاروانێك بوم لە شار دەگەراوە ماندو نەبونیم لێ کردن و رێگای سیاقولم پرسی• یەکیان گوتی :

ــ ئەرێ تۆ میرزا کەریمی حیسامی نی ؟

ــ نا ••• بو چی میرزا کەریم کێیە ؟ بۆ دەپرسی ؟

ــ لە دوکانی خالم بوم دو گروبان هاتن لەوێ دەگەران • لە خالمیان پرســـی یەك دوو قونداخە تفەنگیشیان لێدا •

ــ خالت کێیە ؟ ناوی خالی هێنا دەم ناسی پێم گوت تو خەڵکی سیاقولی ؟

ــ بەلێ خەڵکی سیا قولم •

ـ كه وايه له گويّ دريژەكەت داباژه و له گەلّ من وەره ٠ كورەكه وەك پيـاوان هاته خواريّ و بە هاوالّەكانی گوت : ئيّوه برِوّن من پاشان ديّم ٠ بريّـــــك رِوّيشتين گوتی : دەترسم وه دوات كەون ، با بچينه ئەو دوّلّه له بن ئەو دارگێوژ و شيلانه دانيشين تا رِوّژ ئاوا دەبیّ ٠ ئەگەر تا و پەری دەرِوّين٠ له دوّلّێكـــــی نێزيك رێگا هێندێك داره گێوژو شيلان هەبوو، لامان دا چوين له بن دارەكـــان دانيشتين ٠ رِوّژ ئاوا بوو هەستاين كەوتينه رِیّ ٠ له نێزيك گوندی سياقـــوّل گەيشتينه ئاشێك ، گوتی با سەرێكی ئەو ئاشه بدەين بزانين خەبەری گونـــدی چيه ٠ كه چووينه ئاش تەماشام كرد عەزيزی فەلاحی لەویّ دانيشتووه ٠

ـ كوره عەزيز لێره چ دەكەی ؟

ـ لێره چـاوه روانی توو‌غمنی بلوريان دەكەم ، غمنی پێی گوتم تۆ برِوّ ئێمـەش دێينه سياقوّل ٠

ـ توّ مالی ماوەرانيت به زامن داوه هاتنه دەرت عەيبەو بیّ جێيه٠ئێستـــا ش كەس نەی زانيوه، هەسته بگەرِێوه هيچ له توّ ناكەن٠

عەزيز كه بێكار دەسورِاوه له خولاّی دەويست كه بيانوی بوّ هەلّكەویّ برِوا بوّ جێگايەك و ناوی سياسيش له خوّ بنیّ٠ فايدەی نەبوو گوتی : بوّ كویّ بچی له گەلّ توّ ديّم ٠ تازه ناگەرِێمەوه بوّ شار ٠ چوينه گوندی سياقوّل،ناردم قاسمی سولتانيانيان ديتەوه نيوه شەو هاته لام ٠ پاش چاك و خوّشی و حەسانـــەو ە گوتی : " دەبیّ برِوّين لەوانەيه بەيانی ساواك و ژاندارم بگەنه ئێره٠ بـــەلاّم عەزيز له چی دەگەرِیّ ؟ عەزيز گوتی تازه ناچمـەوه مەهاباد ، دەولّەت زانيويـه رِام كردوه بگەرِێمەوه دەمگرن ٠

عەزيز وەك چەل و مل بەستوّمان داهات ٠ تاريك و روونی بەيانی كەوتينـــه رِیّ ، لای ئێواریّ گەيشتينه گوندی " چوارگا " ٠ هەر پاش ئێمە كورِەكانـــی ماوەرانی له گەلّ دوو ماشێن سەرباز دێته سياقوّل وەدوای عەزيزی فەلاحـــی دەكەون ٠ مالّەكانی گوندی هەموو گەرِابون، بەلاّم تازه عەزيز دەرچووبوو٠

له چوارگا چووينه مالّی برادەرێكی حيزبی ٠ واديار بوو ئەو مالّه مەكـــوّی برادەرانی حيزبی بوو، كرِبويانه ليـه خەرتەل ، بە گەرمی بەخێرهاتنيـــان

کردین ، ئێوارە بوو تەندوریان هەڵکردەوە ، مریشکێکیان کوشتەوە • شەو چەند کەسی خەڵکی گوندی لیێمان کۆبوونەوە• برادەری خاوەن ماڵ کە بە داخەوە ناوەکەم لە بیر چۆتەوە، پاش نان خواردن پرسی :

ــ عەیب نەبێ پرسیارێکم هەیە با بزانم خەڵکی کوێی؟

ــ خەڵکی مەهاباتم •

ــ چی ؟ • • • هەر سێك تەلاقم کەوێ مەگەر بە ڕێبواری بە سابلاغدا ڕۆیشتبی • سابلاخی چی ؟ تو ئەوە چەند سەعاتە لێرەی، دەڵەی سەت ساڵە لە نێو مەنگوڕا- نی • هەموو هەستان و دانیشتنی ئێمە دەزانی • ئەو سەر ڕوتانە (دەستی بۆ قاسمی سوڵتانیان ڕا داشت ) ئەوە سێ سالە لە نێو ئێمەدا دەگەڕێن، ئێستاش دەڵێی تازە لە سابلاخ وەدەرکەوتوون •

شەو تا درەنگ دانیشتین لە سەر وەزعی سیاسی قسەم بۆ کردن • بەیانی برادەرێکی حیزبیان ساز کرد لەگەڵمان بێتە گوندی " سلامەت " نێز گەورکان خۆمان ساز دەکرد کە بڕۆین ، سوارێك بە غار لە گوندی سیاقولەوە گەیشتێ برادەرێکی حیزبی بوو نامەی هێنابوو • کە نامەکەم وەرگرت ، هاشمی حوسێن- زادە نووسیبووی : " سەرۆکی ڕوکنی ۲ بە دوای دا ناردوم • گوتویە خەبەر بدە بە حیسامی بگەڕێتەوە• بێتەوە شار کەس خۆی تێ ناگەینێ • ئێستاش وا بە باش دەزانم سەفەر نەکەی بگەڕێیەوە •

لە گەڵ قاسم کەوتینە ڕاوێژ ، هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە قسەی کار بە دەستانی لەشکرو ساواك جێگای بڕوا نیە • بە برادەرەکەم گوت : "بلێ ڕۆیشتبوو نەیگەیشتمێ • قاسم گوتی : " بۆ خۆم و لامی بۆ دەنووسمەوە•

لە چوارگاوە لە گەڵ برادەرێکی چاو ساخ کەویتینە ڕێ ، شەو چوینە گوندی سلامەت ماڵە مەلا کەریمی، ئەندامێکی تێکوشەری حیزب و پیاوێکی باش و ماڵ خۆش•

لە گوندی سلامەتەوە برادەرێکیان ڕەگەڵ خستین بۆ دیوی بانە• نیوەڕۆ بوو گەیشتینە گوندی " گەنمان" لە حەسارێکی گەورە و ماڵێکی سەرئاوالە لامان دا • پێویست ناکە باسی پیاوەتی و ڕوو خۆشی و میوانگری ئەو ماڵە بکەم•

چونکە لە کوردستان ماڵی ئاوا زۆرن میوانگری و نان دان خەسڵەت و ڕەوشتی جوانی کوردەوارییە ٠ بەڵام ناکرێ باسی جوانێك نەکەم کە لە هەموو ژیانی خۆمدا نەم دیبو قەتیش لە بیرم نەچۆتەوە ٠ کیژێکی پازدە ، شازدە ساڵە، بالاّ بەرز ، چاوکاڵ ، پرچ درێژ ، قیت و قۆز ، سەرکوڵمەی وەك گوڵە باخ ڕەنگی دەداوە ٠ ئێستاش پاش بیست و شەش ساڵ کە ئەم بیرەوەرییانە دەنووسم دەتوانم بڵێم لە هەر شوێنێ کیژێکی فرە جوانم دیتبێ ، ئەم کیژەی کەنەمانم وەبیر هاتۆتەوە ٠ زۆر جاریش باسی جوانی ئەو کیژە کوردەم بۆ برادەران گێڕاوەتەوە، لە بەرامبەر پیاوەتی ئەو ماڵە و جوانی ئەو کیژەدا ، کەسێشم لە هاوالّی بە زۆر پێوە بەستراوەکەی خۆم " عەزیزی فەلاحی " چینگەنەترو هیچ و پوچ تر نەدیوە ٠ لە خۆوە لە ماڵی کابرا لە نان خواردن زیز بوو ٠ دەم و لووتی تێك نا ، دەت گوت کابرا پێی قەرزدارە٠ نانمان خواردو کەوتینە ڕێ ٠ بە عەزیزم گوت :

ـ کەس بە تۆ قەرزدار نیە حەق نیە لە ماڵە خەڵکی جۆرێك بجزویەوە کە خاوەن ماڵ نارەحەت بێ ٠ دەستی کرد بە جنێوان بە کابرای خاوەن ماڵ ، دەیگوت ماستیان هەبوە ، بۆیان نەهێناوین ٠ لە کاتێکدا هێلکەو ڕۆنیان بۆ ساز کردبووین ٠ پەنیریان دانا بوو٠ بێجگە لەوە هەر بە ڕووخۆشی و پیاوەتیان مرۆڤ تێر دەبوو٠ عەزیز نانی نەخوارد ٠ بەڵام لە ڕێگا برسی بوو، برادەرێ لە گەڵمان بوو ، لە ماڵی خۆی نان و شیرێژی هێنا بوو ، داوای لێ کرد لە سەر ئاوێك دانیشت و نان و شیرێژی بە ئاوێ خوارد ٠

شەو گەیشتینە گوندی " سووتو " ٠ برادەرێکی حیزبی زۆر باش و تێکۆشەرمان لەوێ هەبوو چووینە ماڵی ئەو ٠

قالەی مام عەولا یەکێك لەو هاورێ تێکۆشەرو تێگەیشتوانە بوو کە بە ساز هەڵدەکەون ٠ ناوی منی بیستبوو ، زۆری پێ خۆش بوو کە میوانی بوین٠ تەواوی شەو نەی هێشت بنوین ٠ وەك خوێندەوارێکی سیاسی باسی مەسەلەکانی جیهان و ئێرانی دەکرد ـ پاشان گوتی : " سەرم لە کاری حیزبی خۆمان و کردەوەی کادرەکان سوڕ ماوە٠ ئێمە تا ئێستا دژی دەرەبەگەکان خەباتمان دەکرد

ئێستا کادرەکان ئەگەر دەچنە ماڵی ئاغا بە کەیفی ئەو قسە دەکەن ٠ هەریەك دەچنە ماڵی وەرزێرێك دژی ئاغا قسە دەکەن ٠ بێجگە لەوە کادرەکانی ئێمە کتێبی رەش و سەیری کۆمونیزم لە ئێران کە بەختیار نووسیویە دەیگێڕن و بە خەڵکی نیشان دەدەن کە حیزبی تودە خەیانەتی کردوە ٠

من بۆ کاکە قالەم روون کردەوە گوتم ئەوە سیاسەتی حیزب نیە ٠ رۆژێك مەحتەلی کردم دەیگوت : " رەنگە قادر شەریف پەیدا بێ ٠ ئەو دەم لە گەڵ سمایلی قاسملۆ کادری ناوچەی بانە بوون و پێکەوە دەگەران ٠

بە داخەوە ئەوان نەهاتن نەم توانی بیان بینم ٠ رۆژی دوایی کەوتینە رێ کاك قادر بۆ خۆی لەگەڵمان هات لە رێگا دەمێکیش لە پرسیارو باسی سیاسی بی دەنگ نەدەبوو ٠ بە دڵسۆزی و تامەزرۆیی باسی تێکۆشانی حیزب و پەروەردەی کادری دەکرد ٠ دوای نیوەرۆ لە نێزیك سنور گەیشتینە ماڵی برادەرێك ٠ رۆژێك لەوێ حەساینەوە برادەری خاوەن ماڵ زۆر پیاوانە پێمانەوە ماندو بوو ٠ لە گوندێکی دیکە ژن برای خۆی هێنا کە لەگەڵمان بێت بۆ سولێمانی ٠ ئێواری ماڵ ئاواییمان لە کاکە قالەو خاوەن ماڵ کرد بەرەو سولێمانی کەوتینە رێ ٠

تاریکە شەو رێگایەکی هەورازو لێژو بەردەلان٠ لە چوارتا نیوە شەو لە ماڵێك لامان دا ٠ نان و چامان خوارد برێك حەساینەوە، ملی رێگامان گرت و چێشتان بوو لە قەلاچوالان لە ماڵە برادەرێك لامان دا ٠ ئەو ماڵە ناسیارو دۆستی برادەرانی ئێمە بوو ٠ وەك لە بیرم مابێ ناوی خاوەن ماڵ فەتحولا بووماڵێکی سەر ئاوالە چەند کورو برای پیاوو رووخۆش٠ پاش حەسانەوەو نان و چاخواردن کەوتینە رێ و لای ئێواری گەیشتینە سولێمانی٠

من قەت نەچوبوومە سولێمانی ، بە گوێرەی راسپاردەی برادەران دەبوایە بچینە ماڵی " قالە تەگەرانی "

قالە تەگەرانی کابرایەکی کۆنە چەتەو قاچاخچی و دۆستی نێزیکی سەیدعەولای ئیسحاقی بوو٠ برادەرانی حیزبی لە ماڵی ئەو دەبوون ٠ برادەری شارەزا وەپێشمان کەوت و چوینە ماڵی دیاری کراو ٠ قادر بۆ خۆی لە ماڵ نەبو وەك هەموو ماڵە کوردێك بەحێرهاتنیان کردین و حەساینەوە٠ پاش نان و چاخواردن

عەزیزی فەلاحی گوتی : " با بچینە نێو شار، سولێمانی بە شەو جوانە "•

عەزیز پێشتر لە گەڵ غەنی بلوریان چووبووە عێراق و ماوەیەك لە سولێمانی مابۆوە • هەرچەند زۆر ماندو بوم ناچار لە گەڵ عەزیز وەدەر کەوتم • کاتێك گەیشتینە نێو شار عەزیز گوتی :

ـ راستی ئەوەیە من ئارەق خۆرم لە مەهاباد هەموو رۆژێ خواردوومەتەوە • ئیستکانە ئارەقێك نەخۆمەوە دەمرم "•

ـ ئێمە لێرە میوانین ، بەخێر ئینسانی سیاسین و نوێنەری حیزبێکین من نە ئارەق خۆرم نە دەخۆمەوە • تۆش باشترە خۆت رابگری وئارەق خواردنەوەلێرە جوان نیە •

ـ خۆم پێ راناگیرێ •

ـباشە ، خۆت بچوو چ دەکەی بکە ، من ئارەق ناخۆمەوە •

ـ پارەم پێ نیە •

ـ چۆن تۆ بۆ سەفەرێکی ئاوا وەدەر کەوتوی پارەت نەهێناوە •

ـ هیچم نەبوە • من بە تەمای تۆ و غەنی هاتوم • کەچەل نەهاتو خۆی گیڕاوە•

دیتم کابرا خۆی پێ راناگیرێ • گوتم باشە جێگایەك بدۆزەوە ، ئیستکانێك ئارەق بخۆوە من پارەکەی دەدەم• لام وابوو سولێمانیش وەك شارەکانی ئێران مەی خانەو شوێنی ئارەق خواردنەوەی هەیە • گەلێك سوڕاینەوە هیچ شوێنێکمان نەدیتەوە ، تووشی ساختمانێکی گەورە بوین تابلۆێکی زەلام لە سەر دەرگا هەلاوسرابوو ، لێ نووسرابوو : " مصرف‌الرافدین " من عەرەبیم نەدەزانی عەزیز تابلۆکەی خوێندەوەو دەستێکی لە رانی داو گوتی : " ئای داخی گرانم•• ئێرە هەوەو ••• بەڵام داخراوە •

حێگا وەگیر نەکەوت شەو بە ناهومێدی گەڕاینەوە بەیانی کە چووینە بازاڕ تەماشامان کرد ئەو شوێنەی کە عەزیز بە مەی خانەی دەزانی و داخی بۆ دەخوارد " بانکە " • گەلێك پێ کەنین هەموو حارێ کە ئەو باسەم دەگێڕاوە عەزیز بە خۆدا دەشکاوە •

قالە تەگەرانی هاتەوە• ئادرێس و تەلیفۆنی عەولای ئیسحاقی دامێ لە

بەغدا ، تەلیفۆنم بۆ کرد زۆری پێ خۆش بوو بە گەرمی بەخێرهاتنی کـــردم.
بەڵام هاتنی عەزیزی زۆر پێ ناخۆش بووگوتی: " ئەو همتیومت بۆ هێنـــاوە ،
ئەوە نە حیزبیە و نە لە گەڵ کەس دەحەوێتەوە ، بەد ئەخلاقە . سبەی دێم بـــۆ
سولێمانی .

## کتێبخانـــەی گـــەلاوێـــژ

سالی ۱۳۳۲ ـ ۱۹۵۳ لە فیستیوالی لاوانی جیهان لە رۆمانیا لە گـــەڵ
رەئوف مەعروف خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژ لە سولێمانی ببومە ئاشنــــا
ئادرێس و ناوو نیشانمان دابوو بە یەکتر . ئەو دەم ئەو سەرۆکی دەستـــــەی
نوێنەرایەتی لاوانی عێراق بوو . بە دەرفەتم زانی کە کتێبخانەی گەلاوێـــژ
بدۆزمەوەو لە گەڵ ئاشنای قەدیم و پێشکەوتوخواز دیدارێك تازە بکەمەوە . بـــە
خەیاڵی خۆم پێم وا بوو بە دیداری من شاد دەبێ و پێی خۆش دەبێ . نەختێـــك
سورامەوە توشی کتێبخانەی گەلاوێژ بووم . چومە ژوورێ کابرا خۆی بوو یەکــی
دیکەش لە پەنای راوەستابوو . چەند کەس کتێبیان دەکڕی . راوەستام تا ئەوانی
بەڕێ کرد . ئاگام لێ بوو جار جارە لە بنەوە خێسمیەکی لەمن دەکرد . پاشـــان
گوتی : " برا تۆ چت دەویست ؟ چوومە پێشترو سڵاوم کردوو گوتم :
ـ من تەنیا ویستم سلاوێك بکەم و پاش چەند ساڵ دیدارێك تازە بکەمەوە . یادی
سەفەری خۆش و رۆژانی خۆش هەر خۆشە . لە رومانیا پێکەوە بوین ناوونیشانە-
کەم هەر لەبیرە .
کاك رەئوف مەعروف لە بیستنی ئەو قسانە پەشۆکا . گوتی : " من ... مـــن
نەبووم بە هەڵە چووی ... داخوا کێ بووە ".
ـ ئێرە مەکتەبەی گەلاویژ نیە ؟
ـ بەڵێ هەوە ... وا لە سەر دەرگا نووسراوە .
ـ بە هەڵە نەچووم تۆش کاك رەئوفی . ئەو دەم کاك رەئوف بوی، ئێستا کـــە
هەو نی ئیتر ئەوە خۆت دەزانی .

ــ دە بەخوا برا هەو تیم  داخوا کێ بوە ٠

وەدەر کەوتم ٠ عەو لای ئیسحاقی کە ببوە " **ئەحمەد توفیق** " گەیشتبووە سولێمانی و بە دوام دا دەگەڕا ٠ توشی یەکتر بوین ، بەخێرهاتنێکی گەرم و چاو روون بونەوە ٠ لە چای خانەیەك دانیشتینو  پاش هێندی قسەو باس گوتی : کار زۆرە  دەبێ هەر ئەمڕۆ بگەڕێینەوە بۆ بەغدا ٠ بە عەزیزی فەلاحی گوت : "تۆ لێرە بە  لە مالّە قالە تەگەرانی هەتا خەبەرت لێ دەگێرمەوە٠ ئەو کورەی لە گەلّمان هاتبو بانگی کرد چەند دینارێکی دایە ٠ لام وایە سێ دیناریشی دا بە عەزیزی فەلاحی و گوتی با بڕۆین ٠ نیوەڕۆ بۆ نان خواردن چوینە مالّی حەمەی حاجی تاهیر ٠ هێندی کەسی دیکەش لەوێ بوون دەس بە قسەو باس کرا نیوەڕۆك و سەرو بنی قسەکان هەمووی دەهاتەوە سەر ئانتی کۆمونیزم و رەخنەو پەلار لە حیزبی کۆمونیستی عیّراق من سەرم سوور ما تا ئەو دەم حیزبە کۆمونیستەکانم بە دۆست و هاوکارو پشتیوان دەزانی ٠ پێم سەیر بو لە عیّراق لە گەلّ حیزبی کۆمونیست ئاوا ناکۆکی هەیە ٠ گوێم لە قسەکان را گرت وەسەر خۆم نەهێنا ٠ لەو مەجلیسەدا ئەوەم بۆ دەر کەوت عەو لای ئیسحاقی کە بۆتە " ئەحمەد توفیق " لە گەلّ ناو گۆرینی فیکرو بیرو باوەڕیشی گۆڕاوە٠ هەر لەوێ هەستا دوو جار تەلیفۆنی بۆ مەلا مستەفا کرد٠ قسەکانی هەر بۆ خۆڕانان بوون دەنا نرخی پارەی تەلیفۆنەکەیان نەبوو٠

## بەرەو بەغدا

پاش نان خواردن سواری ترومبێل بوین و بەرەو بەغدا کەوتینە رێ چونی بەغدام پتر لە بەر ئەوە پێ خۆش بو کە لە عەزیز وەدور دەکەوتم. کاتێک گەیشتینە بەغدا چوینە مالێك کە بە ئیجارەیان گرتبو پێکەوە دەژیان . قادر شەریف و (هاشمی اقل الطلاب) ، سمایلی قاسملۆ ملا باقی لەوێ دەژیان.

پێشتر ملاباقیم لە زیندانی مەهاباد دیبوو دەم ناسی . تێگەیشتنی سیاسی نەبوو بەلام پیاوێکی فەقیرو ئەمین بوو . پاش دوورۆژ دیتم رەحمانی قاسملۆش پەیدا بوو. زۆر بە گەرمی چاك و خۆشیمان کرد دەرکەوت رەحمانیش هەر لەو خانوە ژیاوە . عەولای ئیسحاقی بە منی گوت : ( رەحمان سەلاحیەتی حیزبی نیە ، قسەی لە سەرە لە تاران گیراوە ، قەولی هاوکاری دابوو بە ساواك . لە سەفەری ئۆروپا ش بۆم دەرکەوت کە لە گەلٚ تودەیە ، دەیویست بە دیاری بماندا بە تودە . بەلام ئەوانیش بڕوای پێ ناکەن.)

گوتم : لام وایە وەختی ئەو حیسابانە نیە رۆژی ئەوەیە کە لەم وەزعەی عێراق بە قازانجی خۆمان کەلك وەربگرین . گوتی دەمەوێ ئاگادار بی باسی کاری حیزبی لە لای رەحمان ناکەین .

چەند رۆژێك بو لە بەغدا بوین.رۆژێك گوتی با بچینە کن مەلا مستەفا . هەستاین چوینە مالی مەلامستەفا ، زۆر دڵنگ هاتە دەر . دانیشتوو ئەحمەد توفیق گوتی : " ئەوە برای تێکوشەرمان کاك کەریمی حیسامی‌یە . چەند سالٚ لە زیندان بووە سەری بۆ دوژمن شۆر نەکردوە ".

من گوتم : رەنگە مەلا مستەفا بمناسیتەوە. لە نەغەدە جیران بووین . خانوی ئێمە بەرانبەر بە مالە شیخ محەمەد سدیق بوو.

مەلا مستەفا گوتی : " لە بیرمە ... وابزانم زۆر جار لە مالی ئێوە شیریان بۆ دێنام .

پرسیم : شێخ سولیمان گەڕاوەتەوە یان نا ؟ لە گەلٚ ئەو پرسیارە هەستم کرد کە تێك چوو . حوابی نەدامەوە . پاشان بۆم دەرکەوت کە لە گەلٚ شێخ

سولێمانی برازای یەك نیە • من لە كاتی خۆی لە ئێران لە گەڵ شێخ سولێمان زۆر رەفیق بوین و باشم دەناسی •

ئەو رۆژە لە ژورێكی تایبەتی لە گەڵ مەلا مستەفا نانمان خوارد لە نێو میوانان نەبوین •

چەند رۆژ پێ چوو رۆژێك رەحمانی قاسملۆ داوای كرد با كۆبونەوەیەكمان هەبێ • كۆبونەوە دەست پێ كرا • رەحمان بە هێدی هەڵسور داسوری عەولای ئیسحاقی بە شێوە كاری تەك رەوی و غەیرە حیزبی دانا پاشان هاتە سەر ئەو بەیاننامەیە كە ئەحمەد توفیق بە ناوی حیزب بلاوی كردبۆوەو نووسیبووی : "بۆرژوازی عەرەب كەوتۆتە سەر ناسینی مافی كورد " • رەحمان گوتی : نێوەرۆكی ئەو بەیاننامەیە لە باری زانستی یەوە هەڵەیە • بۆرژوازی ناتوانێ مافی نەتەوەی ژێر دەست بە رەسمی بناسێ • قسەكانی رەحمان مەنتقی بوو • ئەحمەد توفیق هیچ دیفاعێكی نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ كە دەیگوت رەحمان بە حیزبی ناناسم•

پاش ئەو كۆبونەوەیە رەحمانی قاسملۆ ئێمەی بەجێ هێشتوو چووبوو لە ماڵی خسرو توفیق دەژیا • رۆیشتنی رەحمان لە نێو ئێمە پتر مەیدانی بۆ ئەحمەد توفیق چۆڵ كرد كە بە ناوی حیزب بە كەیفی خۆی بجولێتەوە •

چەند جار مەلا باقی داوای لە من كرد كە بچینە لای مەلا مستەفاو پێی بلێین هەتا برادەرانی دیكە لە ئێرانەوە نەیەن كەس حەقی نیە بە ناوی حیزب قسە بكا • چونكە ئەحمەد توفیق بە تەنیا خۆی بە حیزب دەزانێ و مەیدانی كردۆتە ئی خۆی •

لەو بەینەدا هاتینە سەر ئەو فیكرە كە یارمەتیەك بۆ حیزب كۆ بكەینەوە • ئەحمەد توفیق پرسی بە مەلا مستەفا كردبوو• كارتێكی ساز كردبوو وێنەی مەلا مستەفاو قازی محەممەدو شێخ رەزاو شێخ سەعید و شێخ مەحمودی لە دیوێك چاپ كرابوو لە دیوەكەی دی ژمارەیەك پارە لە گەڵ "یارمەتی بە حیزبی دیموكراتی كوردستان " چاپ كرابوو • بۆ بلاو كردنەوەی ئەم كارتە ئەحمەد توفیق چوبوو ئیجازەی لە عەبدولمەجید مودیری سازمانی ئەمنیەتی

عیّراق وەرگرتبو · پاشان کارتەکەی بردبوە لای مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی عیّراق · ئەو دەم حەمزە عەبدولا ، نیزاد ئەحمەد عەزیز، خسرو توفیق ، سالح حەیدەری ئەو دەستەیە ریّبەری پارتی بوون · ئەگەر بە جۆریّکی دیکە بیلیّین بالّی چەپی پارتی لە سەر کار بوو · حەمزە عەبدولاو مەکتەبی سیاسی ئەوکارەیان بە کردەوەیەکی ناسیونالیستی دانابوو پەسەندیان نەکردبوو، تەنانەت نامەیەکیشیان نەدابویە کە لە کوردستان ریّکخراوەکانی پارتی یاریدەمان بدەن· لەم کارانەدا رەحمانی قاسملوّ بە کردەوە وەلا نرابوو· لە جیاتی ئەوەی لە نیّو ئیّمەدا بژی لە گەلّ خسرەو نیزادو حەمزە عەبدولا رای دەبوارد· ئەحمەد توفیقیش بە ریایی و مەرایی و دانی هیّندیّ خەبەری بە درۆ بە مەلا مستەفا خۆی لە مەلا مستەفا نیّزیك کردبۆوە· هەر لەو کاتەش دا لە گەلّ تاقمی برایم ئەحمەدو عەلی عەبدولاو بالّی راستی پارتی پیّوەندی بە هیّز کردبوو ·

عەولای ئیسحاقی لە گەل من نیّوانی زۆر خوش بو،هەمیشە پیّکەوە دەگەراین· منیش لە کەریمی حیسامیەوە ، ببومە " سالح توفیق " ·

بارزانیەکان لەو سەرو بەندەدا لە یەکیّتی سوڤیەتی دەگەرانەوە· بۆ پیّشوازی لە بارزانیەکان چوینە بەسرە، لەویّ لەو هوتیلە میوان بوین کە مەلا مستەفای لیّ بوو ·

هەوەلّی زستانی ١٩٥٩ من و ئەحمەد توفیق و قادر شەریف و سمایلی قاسملوّ چوینە سولیّمانی لە مالّی قالە تەگەرانی میوان بوین · ناکریّ بلّیّم میوان لە راستیدا مالەکەی بۆ ئیّمە وەك بنکەی حیزبی بوو· هاتینە سەر ئەو باوەرە کە ژمارەیەك رۆژنامەی کوردستان دەرکەین· وتارەکانمان نووسی و بە رۆنیو چاپمان کرد· ئەحمەد توفیق دەیبردە نیّو شار دەیدا بە خەلّکی دەیگوت لە کوردستانی ئیّرانەوە هاتوە ·

پاشان هاتینە سەر ئەو باوەرە کە چەند برادەریّك بگەریّنەوە بۆ کوردستانی ئیّران · رۆژنامە لە گەلّ خۆیان بەرنەوە، بریارمان دا قادر شەریف و سمایلی قاسملوّ بگەریّنەوە· خۆیان ئامادە کرد کە برۆن دەبوایە پارەیەکیان پیّ بیّ·

له پڕ ئەحمەد توفیق گوتی : سەت دینارم پێ بوە کە وەدەر کەوتوین لە ژوری لێم بەجێ ماوە. دەستمان کرد بە گەڕان و پرسیار . گوتیان کاری نۆکەری قالە تەگەرانی یە. کابرای فەقیرو هەژارمان هەڵپێچا دەگریاو دەپاڕاوە دەیگوت : هیچم نەدیوە. دەستمان لێ هەڵگرت . هێندێکمان هاتینە سەر ئەو باوەڕە کە ئەگەر ئەحمەد توفیق پارەی لێ بەجێ مابێ ، بێجگە لە قالە تەگەرانی کەس هەڵی نەگرتوە . بە کورتی سەت دینار بێ سەرو شوێن چوو. ئەحمەد توفیق سەت دیناری دیکەی لە قالە تەگەرانی قەرز کردوو قادر شەریف و سمایلی قاسملۆمان بەرەو ئێران بەڕێ کردەوە.

چەند ڕۆژ لە سولێمانی بوین پاشان من و ئەحمەد توفیق چوینە رانیە. کاتێك گەیشتینە رانیە ئێوارە بوو، بەڵام ئێمە گیر نەبوین ماشینێکمان بە کرێ گرتو چوینە سەر کەبکان مالە " **عەباسی مامەند ئاغا** " بەفرێکی زۆر و ساردو سەرما بوو. کاتێک ئێمە لە رانیە گیر نەبوین ئەو فیکرە بو هێندێ کوردی ئازادیخواز ! هاتبوە پێش کە ئێمە پیاوی حکومەتی ئێرانین و هاتوین بۆ لای عەباسی مامەند ئاغاو گۆیا دژی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم خەریکین ئاژاوە ساز بکەین.

وەزع و هەوای کوردستان بۆ ئەم فیکرە ئامادەیی هەبوو. ڕێکخراوە سیاسیە. کان نەك هەر یەك نەبوون ، بەڵکو دەستیان کردبوو بە دم بە دمەو بەربەرەکانی یەکتر. بە تایبەت لە کوردستان لە نێوان ئەندامانی حیزبی کۆمونیست و پارتی دیموکراتی کوردستان دا ناکۆکی تەواو هەبوو. پارتی وەك حیزبێکی کوردی دەیویست بەشی زۆری تاقم و توژی کۆمەلی کوردەواری لە ریزی خۆیدا کۆ بکاتەوە . بۆ ئەو مەبەستە بۆرژوازی کوردو سەرۆك عەشیرەتەکانی کە رابردوی سیاسی خەیانەتیان نەبوو بۆ لای خۆی رادەکێشا . حیزبی کومونیستیش پتر باری چینایەتی لە کوردستان بە هێز دەکرد . کۆمونیستە کوردەکان لە کوردستان هێندێك چەپ رەوی و هەڵەشەییان دەنواند و مەسەلەی نەتەوایەتیان زۆر بە هێند نەدەکرد .

پریشکی ئاگری ئەم ناکۆکیە وە ئێمەش دەکەوت . ئەحمەد توفیق کە بە

نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ناسرابوو، بە گوێرەی بیروباوەڕ و هەڵوێستی خۆی ، نەی کردبوو بێ لایەنی خۆی بپارێزێ • نەك هەر پتر لە گەڵ پارتی هاوکاری دەکرد و نێزیك ببۆوە ، بەڵکوو بە قسە هێندێ جار پتر لە ئەندامانی پارتی دژی حیزبی کۆمونیستی عێراق دەبزووتەوە• هەر ئەم هەڵوێستەش لە لایەك لە مەلا مستەفای وە نێزیك خستبوو ، لە لایەکی دیکەشەوە ئەندامانی حیزبی کومونیست بە چاوی دۆستانە تەماشای ئێمەیان نەدەکرد • لە کاتێکا سیاسەت و نووسراوەکانمان دژی ئیمپریالیزم و دژی ڕێژیمی دیکتاتۆری شابوو •

هەر چونێك بێ من بیرەوەریەکانم دەنووسم و ناچمە سەر لێکۆلینەوەی وەزعی ئەودەمی عیراق •

لە ڕێگای نێوان ڕانیە و سەرکەپکان ماشینەکە گیرساو هەرچەندی کردمان نەهاتە دەر • ماشێنمان بە جێ هێشت و بە پێیان ، بە سەرماو بە هیلاکی گەیشتینە سەر کەپکان هەباس ئاغا زۆر پیاوانە بە خێرهاتنی کردین شەوێکی خۆشمان ڕابوارد بۆ بەیانی تازە چامان دەحواردەوە ئەفسەرێك و چەندپۆلیس گەیشتنە سەر کەپکان و لە دیوەخانی ئاغا وەژور کەوتن •

هەباس ئاغا بەخێرهاتنی کردن پرسی : " خێرە بەو بەیانیە ؟

ــ خێر دەبێ ئیشەڵڵا••• دوێنێ دوو ئێرانی هاتونە ئێرە ، هاتوین لە گەڵ خۆمان بیانبەین •

هەباس ئاغا گوتی : " دانیشن بحەسێنەوە، پاشان قسەی لێ دەکەین • من وەدەنگ هاتم گوتم : " زۆر بەخێر بێن ئێرانیەکە منم لە گەڵتان دێم و لەگەل قایم مەقام قسە دەکەم • نان و چایان خوارد و لە گەڵیان سوار بووم و چوومە ڕانیە• ئەحمەد توفیقم بەجێ هێشت •

کاتێك لە بەغدا وەدەر کەوتبوین ، ئەحمەد توفیق ناوی حۆی و منی دابو بە مودیری ئەمن • لە ڕانیە چوومە لای قایم مەقام و پێم گوت ••• ڕاستە ئێمە کوردی ئێرانین ، بەلام دۆستی حکومەتی عێراقین و بە ئیجازەی حکومەت لێرەین • تکایە ئەم دوو ناوانە لە مودیری ئەمنی عام بپرسە• یەك دوو پۆلیسی

کوردی خەڵکی بیتوێن لەوێ بوون لە رادە بەدەر پێمەوە ماندوو بوون وخزمە-
تیان کردم ، زۆری پێ نەچوو هەباس ئاغا لە گەل چەند پیاوی چەگدار هـات
لەو کاتەدا حەبەر هات کە عەبدوالوەهاب شەواف لە موسل کودەتای کردوە و
شەڕ دەست پێ کراوە . ئەو حارە مودیری پۆلیس و قایم مەقام دەترسان . بانگیان
کردم و گوتیان :
ـ ئێوە دەبێ کارێکی وا بکەن هەباس ئاغا لێرە دژی حکومەت رانەپەڕێ . وەزعی
ئێمە لە مەترسی دایە ، ئێوە دەبێ یارمەتیمان بدەن . خەبەری شەڕ لە نێـو
خەڵکدا ئالۆزیەکی پێك هێنابوو . لە گەڵ هەباس ئاغا شەوێ لە رانیە ماینـەوە
چووینە ماڵە زڕدایکی هەباس ئاغا کە لە رانیە خانوی هەبوو . دوو هەوێ کـە
هەر دووکیان ژنی مامەند ئاغای ئاکۆ بوون و زڕدایکی هەباس ئاغا بوون .
پێکەوە دەژیان ماڵێکی خۆش و خانەدان و ژنی بەڕێز بوون .
بۆ سبەینێ ئەحمەد توفیقیش هاتە رانیە . لە بەغداوە بە قایم مەقامیـان
گوتبو ، ئەوانە ئازادن و کارتان پێیان نەبێ . لە رانیە شێخ حەمیـد
بانگێشتنی کردین هێندێ ئەندام و کادری پارتی دەهاتنە لامان و یارمەتیەکـی
باشیان بۆ کۆ کردینەوە . دیتنی شێخ حەمید لە رانیە بناخەی دۆستایەتیەکـی
خۆشی لە گەڵ من دامەزراند تا ئەو سالانەش پێکەوە دۆست بوین و هات وچۆ-
مان هە بـوو .
بڕیارمان دا ئەحمەد توفیق بچێتەوە بەغداو من لە کوردستان بمێنمـەوە ،
بەڵکو بتوانم هێندێ لە کارتەکانی چاپکراو بڵاو بکەمەو یارمەتی وەربگرم .
لە گەڵ هەباس ئاغا چوینەوە سەر کەپکا . لەو سەرو بەندەدا لە بیتوێن بەفرێك
باری کە لە پێشدا قەت نەباریبو . یەك دو رۆژ لە سەر یەك دەچوینە راوە کـەو
هێندێ لە لاوانی گوندی بەیانی دەچوون کەویان لە شاخی هەڵ دەفڕاند تـا
دەگەیشتنە سەر لوتکە چیا کە دەبڕاوە . لەوێوە ناچار دەفڕین بۆ چیای ئەوبەر
بەلام نەدەگەیشتنێ و دەکەوتن . خەلك لە نێو بەفر پێ وەردەبون .
رۆژێك لە گەڵ هەباس ئاغا چوینە ماڵی شێخ خدری لە سەید ئاوا نێزیـك
رانیە . شێخ خدر پیاوێکی خوامێرو نیشتمانپەروەر لام وایە یارمەتیەکـی

باشی دامێ . پاش چەند رۆژ هەباس ئاغا پیاوێکی لە گەڵ ناردم بۆ سەر خمە ماڵی قادری سوار ئاغاو لەوێشەوە بۆ کۆیە . لە سەر کمپکان لە گەڵ مامۆستا کەریم شێخانی بوم بە ئاشنا ، کوردێکی دڵسۆز ، پیاوێکی بەشەرەف کوردی زانێکی باش دۆستایەتیمان تا ئەو سالانەش بەردەوام بوو .

لە سەرکمپکانەوە لە گەڵ پیاوی هەباس ئاغای سوار بوین شەوێ چوینە گوندێ سەر خمە . هەرچەند هەباس ئاغا پیاوەکەی راسپاردبوو کە قادر ئاغا یارمەتیم بدا ، پێشی گوتبوو کە کێم و لە چی دەگەڕێم . بەلام شەو لە دیوەخانێکی رەق و تەق لە گەڵ پیاوەکەی هەباس ئاغای ماینەوە . قادر ئاغا هەر نەهاتە لام بەیانی بە چا پەزیدا پێنج دیناری بۆ ناردبووم . پێنج دینارەم وەر نەگرت ، گوتم بە قادر ئاغای بڵێ زۆر شەرمە لە دوێنێ وە لێرەم لە پاڵ ژنان نەهاتۆتە دەر .

سورا بوین چوینە کۆیە میوانی کەمالی حاجی مەجید بوین .

لە ماڵی کەمال زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردین . بە کەمالم گوت کە لە لایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە دێم . کەمال بە رێکخراوی پارتی راگەیاندبوو . چەند برادەرێکی پارتی هاتنە لام پاشان بردیانم بۆ ماڵی دوکتۆر خالید سەعید کورێکی جوامێر ، نیشتمانپەروەر ، دڵسۆز ماڵێکی ئاوەدان . خالید لەو کوڕانە بوو کە لە هەموو رۆژوو روداوەکانی دوایش دا وەك دۆستێکی خۆشەویست حیسابم لە سەر دەکرد . هەر چەند سەبارەت بە بیرو باوەڕی مارکسیستی ناکۆکیمان زۆر بوو بەلام دۆستایەتیمان بە هێز بوو .

لە ماڵی خالید هەموو شەو کادرو ئەندامانی پارتی دەهاتنە لام ، لە سەر وەزعی کوردستان قسەمان دەکرد . چای خانەیەك هەبوو شەوێ پارتیەکان لەوێ کۆ دەبوونەوە ، شیعریان دەخوێندەوە ، وەك بزانم کاکە سور هەڵسوڕێنەری ئەم بەزمە بوو . چای خانەی کۆمونیستەکانیش جیا بوو ئەوانیش لەوێ کۆ دەبوونەوە شەوێك چەند مامۆستای ئەندامی حیزبی کۆمونیست هاتنە لام . بەلام هەموو قسەو پرسیاریان لە سەر پێوەندی حیزبی تودەو حیزبی دیموکرات بو . کاتێك باسی یارمەتیم هێنا گۆڕێ ، مات بوون و هیچ یارمەتیان نەدا پێیان وابوو کومەك بە دژی شۆڕش دەکرێ !

له کۆیه له گەڵ کاکه زیاد بووم به ئاشنا ٠ من هێشتا له ئێران بووم لـــەو کوردانەی گەرمێن وکوێستانیان دەکرد ناوو ناو بانگی حەمە ئاغای کۆیـــــەم بیستبوو٠ ئەو چەند رۆژەی له کۆیه بووم بۆم دەرکەوت کاکه زیاد شوێنـــی حەمەئاغای گوێبڕ نەکردۆتەوه٠ چەند جار بانگی کردم بەو بۆنەوه زۆر کەســـی دیکەشی بانگێشتن دەکرد یارمەتیەکی باشی پێ کردین ٠

با لێرەدا خۆشی ئەو سەفەرەش نەشارمەوه٠ ماڵی کاك سەعیدی حەمە قالـــه له کۆیه باخەوان و بێستانچی کاکه زیاد بوو٠ کاك سەعید حەڵکی مەهابادوله سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستاندا یەکێك له تێکۆشەرەکان بوو٠ رایکردبوو، وەك زۆر کەسی تر هاتبوه کوردستانی گەرمێن و له کۆیه گیرسابۆوه٠ سابلاخیگەری له هەموو شوێنێك خۆ دەنوێنی له هێندێك جێ بۆ هێندێك کـەس تامی خۆشی پێوەیه ٠ کاك سەعید بردمی بۆ ماڵی خۆیان٠ کچێکی هەبوو بـــه ناوی ئامین تازه دەگەیشتێ ، شۆخ ، جوان ، شیرین ، لەبەر دڵان٠ هێندێك رۆژ که بێکار دەبووم دەچوومه ماڵی کاك سەعیدو له گەڵ ئامین قسەی خۆشمـــان دەکرد٠

حەوتویەك پتر له کۆیه مامەوه ئیحترام و دۆستایەتی برادەرانی پارتـــی و پیاوەتی کاکه زیاد و دۆستایەتی دوکتۆر خالیدو خۆشی ماڵی کاك سەعیـــدم لەبیر ناچێتەوه ٠ ئەحمەد توفیق رۆژێك عەزیزی فەلاحی ناردبوو که بگەرێمـەوه بۆ بەغدا ٠ عەزیزی فەلاحی پاش ئەوه که ئەحمەد توفیق له سولێمانی بەجـــێ- هێشت ، هاتبوه بەغداو چووبۆوه هوتێل سامان ٠ خانوەکەی ئێمەی پێ نە دەزانی بەلام محەمەدی دەلالی دیتبۆوه ٠ محەمەدی دەلال دۆستی ئەحمەدتوفیق بوو بـه ماڵەکەی ئێمەی دەزانی ٠ رۆژێك کوت و پڕ عەزیزی فەلاحی هێناو وەژور کەوت٠ تازه هیچ نەدەکرا عەزیز له نێو ئێمه مایەوه٠

له کۆیه را چوومه هەولێر٠ له هەولێر میوانی شەمسەدین مفتی بووم یـــەك دوو رۆژ له هەولێر مامەوه پاشان گەرامەوه بۆ بەغدا ٠

## تـــودەییـــە کـــان لـــە بـــەغـــدا

لەم بەینە دا دوکتۆر رادمەنیش سکرێتێری حیزبی تودەی ئیران چەند ئەندامێکی حیزبی تودەی هێنابوە بەغدا بەو نیازە بەڵکو بتوانن لە ئێراندا تەشکیلاتی حیزبی زیندو کەنەوە٠ هەر لەو کاتەشدا هەوڵیان دەدا کە لە گەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانیش بکەنە یەك، بەو مانایە بە بیرو باوەڕی ئەوان دەبوایە حیزبی دیموکرات ببێتە رێکخراوی حیزبی تودە لە کوردستان ٠ یەك دوو کەسیان لە باکۆوە هاتبوون بە داخەوە بە هیچ جۆر لە مەسەلەی نەتەوایەتی تێ نەدەگەیشتن ٠ بەڵام پیاو حەق بڵێ لە چێشت لێنان و میوانداری هاوتایان نەبوو٠ زۆر جار ئێمەیان بانگ دەکرد بۆ نان خواردن بەو هیوایەش مەسەلەی حیزبی دیموکرات یا مەسەلەی کورد لە ئێران هەر بەو کۆبونەوانە چارە سەر دەکرێ٠ نێوانی ئەحمەد توفیق و قاسملۆ تا دەهات ناخۆشتر دەبوو ئەحمەد توفیق دەیگوت رەحمان لە گەڵ حیزبی تودەیەو دەیەوێ حیزبی دیموکرات لە بەین بەرێ ٠ دیارە هێندێك هەڵوێستی قاسملۆ ئەو فیکرەی لە نێو برادەرانی دیکە دا بە هێز کردبوو٠ قاسملۆ زۆر کەم دەهاتە لای ئێمە ، پتر لە گەڵ تودەییەکان یا لە گەڵ نیژادو هەمزە عەبدوڵڵا بوو٠ بێجگە لەوە ژنەکەشی هێنا بوە بەغدا بە هۆی مەلا مستەفاوە لە وەزارەتی رێگاو بان لە لای نوری شا وەیسی رەحمەتی دامەزرابوو٠ بۆ خۆشی لە زانستگای بەغدا دەرسی کوردی دەگوتەوە ، لە راستیدا پێوەندی بە حیزب و تێکۆشانەوە نەبوو٠ بەڵام هەر لەو کاتەشدا دەیگوت بڕیارمان داوە ( دیار نەبوو کێ بڕیاری داوە ) کە ئەحمەد توفیق بچێتەوە بۆ ئێران لە ناوچەی سنە کاری حیزبی بکا ٠ بەڵام یاخی بووەو ناگەڕێتەوە ٠

## سەر ســووڕمانێـــك

ڕۆژێك کاك عومەری کوڕی شیخ عوبیدوڵڵای زینوێ لە بەغدا هاتە لام گوتی

پێم حۆشە بچم لە یەکێتی سوڤیەتی بخوێنم • هاتووم لە گەڵم بێی بۆ لای مەلا-مستەفا بەڵکو یارمەتیم بدا کە لە سوڤیەت قبولّم بکەن و بچم بخوێنم •
زۆرم پێ خۆش بوو • شێخ عوبیدوڵلاّ و عومەری کوڕی منیان دەناسی. دەیانزانی بیرو باوەرم چیە، خۆشیان دەویستم • منیش زۆر حار گوتبوم خۆزیا دەچووی لە سوڤیەت دەتخوێند• زۆر بە تێ رادیوی لە گەڵ کاك عومەر چوینە ماڵی مەلا-مستەفا • دانیشتین، چامان خواردەوە پاشان عەرزی مەلا مستەفام کرد:
"کارێکی تایبەتیمان هەبوو ئەگەر وەخت هەبێ عەرزت بکەین "•
زۆر بە خۆشی هەستاو چوینە ژورێکی چۆل و دانیشتین• گوتم: "کاك عومەر دیپلۆمی وەرگرتوە ، حەز دەکا حوێندنی بەرز درێژە پێ بدا • ئەگەر تۆ یارمەتی بدەی دەیەوێ بچێ لە یەکێتی سۆڤیەتی بحوێنێ "•
مەلا مستەفا بە شێوەیەکی زۆر ناحەزو تووڕە گوتی :"بۆ دەچی ؟ •••دەچی ببێتە ولاخ••• ببێتە کەر••• ببێتە ماشێن ؟ لەوێ ئینسانیەت هەیە؟ هەموو وەك ولاخ دەبێ کار بکەن ، کارو کارو کار • بۆ دەچێ ؟
ئیتر من تاسام واقم وڕ ما ، قسەم پێ نەکرا • کاك عومەریش وەك ئاوی ساردی پێداکەن سپی هەلگەڕا • لە سەری نەڕۆیشتین بێ دەنگ رابوین و وەدەرکەوتین •
کاك عومەر گوتی : " ئەوە ح بوو ، ئەدی ئەو چەند ساڵە لە سوڤیەت چۆن ژیاوە • من کە چەند ساڵ هاتوو چۆی زینوێ شێخیم کردبوو، لە هەموو قسە و باسێکیشدا تەعریفی یەکێتی سوڤیەتیم کردبوو پاش ئەو قسانەی مەلا مستەفا نەمتوانی هیچ بلێم• حوابی عومەرم پێ نەدراوە • بەلاّم لە دلّی خۆمدا قسەکانی مەلا مستەفام پێ ناخوش بوو•

## وەزعەکە شپرزەتر دەبوو

پاش هەرای موسڵ وردە وردە نێوانی مەلا مستەفاو کۆمونیستەکان بەرەو ساردی دەچوو . دەورو بەری مەلا مستەفا بۆ تێکداتی پێوەندی کۆمونیستەکان و مەلامستەفا دەورێکی گلاویان هەبوو . رەحمانی قاسملۆ (ئەو دەم هێشتا دوکتۆرای وەر نەگرتبوو ) لە پێشدا لای مەلا مستەفا زۆر نێزیك و بە قەدر بوو بەلام بە هاتوو چۆی مامۆستا همزەو نیژاد و خەسرەو توفیق و دو زمانی ئەحمەد توفیق لای مەلا ستەفا قەدری نەمابوو مەیدان بۆ ئەحمەد توفیق ئاواڵە بوو بە کەیفی خۆی ڕای دەدا . ئەو دەم مەلا مستەفا مامۆستا همزەو نیژادو رێبەرایەتی ئەو دەمی پارتی لە سەر کار وەلا نابو . ئەو کەسانەی لەوانیش نێزیك بوون لە بەر چاوی مەلا مستەفا دەکەوتن .

ئێمە زۆر جار دەچوینە لای مەلا مستەفاو بە جیا لە میوانان لە گەڵ ئێمە نانی دەخوارد . ئەحمەد توفیق هێندێ رەسمی مەلا مستەفای ناردبۆوە بۆ ئێران و بلاو کرابونەوە .

لەم سەرو بەندەدا قادر شەریف گەڕ اوە بۆ بەغداو قاسمی سولتانیا ـ نیشی لە ئێرانەوە لە گەڵ خۆی هێنابوو . ئەحمەد توفیق داوای کرد کە کۆبونەوەیەکی حیزبی مان هەبێ . من پێشنیارم کرد کە پێویستە رەحمانی قاسملۆش بەشدار بێ . ئەحمەد توفیق گوتی مەلا مستەفا لیی نورەبە ، ئەو لە گەڵ شیوعیەکان و لە گەڵ همزە عەبدوللا رێگای خۆی جیا کردۆتەوە . بە کورتی زۆربەی بەشدار بوەکان دژی ئەوە بون کە قاسملۆ بێتە نێو کۆبونەوە .

رۆژی پێش کۆبونەوە ئێوارەیەك ئەحمەد توفیق بە کەیف و شاد هاتەوە زۆرو سەدو پەنجا دیناری هێنا دەرو لە گۆڕێ دایتا - گوتی : فرۆشتنی کارتی یارمەتی ئاوا دەبێ .

یەکێك لە کوڕەکان پرسی : ئەوە کێ وا پیاو بوە؟

ـ کارتان بەوەدا نەبێ پارەکە هەڵگرن ٠

مەلا باقی حیسابدار بوو پارەکەی هەڵگرت ٠ پاشان ئەحمەد توفیق بە منی گوت : چوومە لای عەبدولمەحید مودیری ئەمن ، کارتێکی ١٥٠ دیناریم لە پێش دانا ٠

من دەمێك بوو لە هەڵسوڕان و چالاکی و پێوەندی ئەحمەد توفیق لەگەڵ ئەمنی عێراق وەشك کەوتبوم ٠ بەڵام دۆستایەتی کۆنم لەگەڵ سەید عەولای ئیسحاقی (ئەحمەد توفیق) بەسەر فیکرکردنەوەو بڕیاردانم دا زاڵ بوو٠ مەلا باقی زۆر حار دەهاتە لام و دەیگوت : فیکرێك بکەوە ، ڕەحمانی قاسملۆ ڕەگەڵ تودەو هەمزە عەبدولا کەوتوە ئەحمەد ئەوە دەبینێ چ دەکا ئەگەر زوو تەکبیرێك نەکەی توشی هەڵدێری گەورە دەبین ٠

کۆبوونەوەی پێشنیارکراو لە حەساری ماڵەکەمان دا ئێوارەیەك پێك هات ٠ لەو کۆبونەوەدا ئەحمەد توفیق ، قادر شەریف ، مەلا باقی ، قاسمی سولتانیان ، عەزیزی فەلاحی و خۆم بەشدار بوین ٠

کۆبونەوە بە دەم بە دەمەی ئەحمەدتوفیق و قادر شەریف دەس پێ کرا ٠ تۆزێك ڕەخنەی غەیرە حیزبی و غەیرە سیاسیان لە یەکتر گرت ٠ من بڕێکیان بە سەر دا هاتم و گوتم با بزانین بۆ چی کۆبوینەوە ؟

ئەحمەد توفیق گوتی : دەولەتی ئەمریکا هاتۆتە سەر ئەوە کە یارمەتی کورد بدا قەولی داوە ٠ ئێمە پێویستە لەو هەل و مەرجە کەلك وەر بگرین ٠

قاسمی سولتانیان بە توندی بەگژ ئەو قسانەدا چوو ٠ بۆ ئەوە کە پتر نەخشەکە ئاشکرا بێ و ڕێگای پێوەندیەکەی بدۆزمەوە گوتم : ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرینگە پێویستە بیری لێ بکەینەوە بۆ پیوەندی گرتن دەبێ ڕێگای باش و پیاوی دڵنیاو سیاسی بدۆزینەوە ٠

ئەحمەد توفیق گوتی : حیزب بیری لەوە کردۆتەوە ، ڕێگای دەدۆزێتەوە ٠

گوتم : وشەی حیزب زۆر جار بەکار دەهێندرێ، حیزب کێ یەو چی یە ؟ ئێستا حیزب لە ئێمەدا ساخ بۆتەوە ، ئێمە پێویستە بریار بدەین .

مەلا باقی گوتی پێویستە پرس بە مەلا مستەفا بکەین بزانین بۆ ئەو کارە رازی یە ؟

ئەحمەد توفیق گوتی : مەلا مستەفا کوردە کوردستانی دەوێ .

پاش باسێکی زۆر هاتینە سەر ئەو بریارە کە ئەو مەسەلەیە لە گەڵ برادەرانی حیزبی لە ئێران باس بکرێ. بریار درا ئەحمەد توفیق نامە بۆ برادەران بنوسێ .

رۆژی دوایی رەحمانی قاسملۆم چاو پێ کەوت مەسەلەکەم لە گەڵ باس کرد گوتم ئەحمەد توفیق مەسەلەیەکی ئاوای هێناوەتە گۆرێ. بریارمان داوە نامە بۆ برادەرانی ئێران بنوسین .

رەحمان گوتی : چۆن تۆ رێگا دەدەی مەسەلەی ئاوا باس بکرێ و پێشنیاری ئاوا بێتە گۆرێ ؟

گوتم : مەبەستم ئەوە بوە کە باش لە نەخشەی ئەحمەد توفیق ئاگادار بم . بەڵام تۆ بۆچی خۆت شاردۆتەوەو کەس نازانی چ دەکەی ؟

ئەو دەم ئیتر لە راستیدا رەحمانی قاسملۆ کاری بە مەسەلەی حیزب و تێکۆشانەوە نەبوو . کاری پەیدا کردبوو لە زانکۆی ئەدەبیات دەرسی کوردی دەگوتەوە . خێزانی کە بە پاسپۆرتی عیراقی بە ناوی " مەدیحە کاظم " چووبو وە چیکوسلوواکی و لە پراگیش هەر بەو ناوە بۆ ئەوە کە بورسی خوێندن وەر بگرێ وەك بێگانەیەك لە زانستگا ناوی خۆی نوسیبوو ، هێنابویەوە عێراق و لە وەزارەتی رێگاو بان لە لای کاك نوری شاویس کە مودیری عام بوو دای مەزراندبوو مەعاشی وەردەگرت .

لە لایەکی دیکەش پتر هاتوچۆی تودەیەکان و مامۆستا هەمزەو نیژادی دەکرد . کاری بە ئێمەو بە حیزبی دیموکرات و بە تێکوشانەوە نەمابوو .

پاش کۆبونەوەی گۆرین بریار درا کە ئەحمەد توفیق نامە بۆ مەهاباد بنێرێ .

که ژن و منداڵەکەی من بنێرن بۆ عیراق ·

پاش ئەوە کە کۆبونەوە تەواو بوو، قاسمی سولتانیان هاتە لام و گوتی "ئێمە بۆ کوێ دەچین ؟ ڕێبازی حیزبی ئێمە کەی ئەوە بوە ؟ ئەگەر فیکرێك نەکەیەوە توشی خیانەتێکی گەورە دەبین " گوتم لێرە هیچ ناکرێ نامە بۆ غنی بلوریان دەنوسم تۆ لە گەڵ خۆت بیبەوە، کارێکی وا بکە بگا بە دەستی غەنی · ئێستا خەریکن تو لێرە گلِ دەنەوە ، بەلام نابێ قەبوڵ بکەی ، ئەگەر لە بەر خاتری نامەکەش بێ هەر دەبێ بگەڕێیەوە· نامەیەکی دورو درێژم بۆ غنی بلوریان نووسی وەزعی عێراق و هەڵسوڕانی ئەحمەد توفیق و لا دان لە ڕێبازی حیزب و وەزعی برادەرانم بۆ نووسی · داوام لێ کرد ئەگەر بۆ کۆبونەوەش بێ پێویستە سەفەرێك بۆ عێراق بکەی · یا بێیە سنوری کوردوستانی عێراق تا لەوێ کۆبینەوەو بەڵکو بتوانین چاری وەزعەکە بکەین · پاش رون کردنەوەی وەزعی عێراق وەزعی ئەحمەد توفیق پێشنیارم کردبوو ئەم خاڵانەی خوارەوە لە گەڵ کۆمیتەی شاری مەهاباد باس بکا :

١- سەید عەولای ئیسحاقی ( ئەحمەد توفیق ) سالێك مەسئولیەتی حیزبی لێ بستێنرێتەوە و لە جێگایەك دابندرێ موتالا بکاو بخوێنێتەوە ·

٢- دەر کردنی بەیاننامەیەك و مەحکوم کردنی بیرو باوەڕی ناسیۆنالیستی ویشك و بەرچاو تەنگ ·

٣- مەحکوم کردنی کردەوە چەوتیەکانی ئەحمەد توفیق ·

٤- پیوەندی نێزیك و دۆستایەتی لە گەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و حیزبی کۆمونیستی عیراق · حیزبی دیموکراتی کوردستان لە پێوەندی نێوان پارتی و حیزبی کۆمونیست دا دەبێ بێ لایەنی و دۆستایەتی خۆی بپارێزێ ·

٥- پێوەندی نێزیك و هاوکاری لە گەڵ حیزبی تودەی ئێران ·

٦- هەوڵ دان بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە وەك ئۆرگانی حیزب ·

٧- هەوڵ دان بۆ ئامادە کردنی کۆنگرە یان کۆنفرانسی حیزبی ·

٨ـ روون کردنەوەی وەزعی رەحمانی قاسملۆ ٠

نامەکەم دا بە قاسمی سولتانیان و رام ئەسپارد کارێکی وا بکا ئەو نامەیە بدریّ بە غەنی بلوریان ٠ هەر وەها نامەیەکیشم نووسی بۆ کۆمیتەی شاری مەهاباد کە لەگەلّ وسێن مەراغەیی شەریکە دوکانم حیساب بکەن و هەر پارەیەکی وەبەر من دەکەویّ چوارسەد تمەنی لیّ بدەن بە یوسفی ریزوانی با کاسبی پێوە بکا ٠ هەر چی ماوە بیدەن بە خێزانم و بینێرن بۆ کوردوستانی عێراق ٠

## وەزعی ماڵ و منداڵم دوای چونم بۆ عێراق

پاش ئەوە کە ڕۆژی ۲۹ ی ژانویەی ۱۹۵۸ شاری مەهابادم بەجێ هێشت دایکم نەخۆش بوو، منداڵێکی چوارمانگەمان هەبوو . بەجێ هێشتنی پیرە- دایکێکی نەخۆش و ژنێکی جوان و جحێل و منداڵێکی چوارمانگـــــە بێ کەس و بێ سەرپەرشت داخ و دەردێکی گران بوو . بەڵام لە ڕێگــــای پاراستنی شەرەف و کەرامەت و ناو و پرستیژی حیزب دا، فیداکاریەکـــی کەم بوو .

پاش ڕۆیشتنی من زۆری پێ ناچێ دایکم بە نەخۆشی دەچێتەوە ماڵــــە خوشکم و لەوێ بە دەردو داخەوە سەردەنێتەوە . خێزانم هەڵدەستـــــێ دەچێتەوە نەغەدە ماڵە بابی ، بەو هیوایە لەوێ بمێنێتەوەو لە مەهاباد بە تەنیا لە خانو دا نەبێ . بەڵام بابی ڕای ناگرێ تەنانەت ناهێڵن شەوێکیش لە ماڵیان بێ . ناچار شەوێ دەچێتە ماڵە حەمەدی خانمێ کە یەکێك لــە ئەندامانی تێکۆشەری حیزب و جوامێرو گەورە پیاوی ناوچەو دۆســـت و هاوڕێیەکی دڵسۆزی من بوو . شەو لەوێ دەمێنێتەوە و بەیانی دەگەڕێتەوە بۆ مەهاباد .

لە سەر ڕێگای نەغەدە ـ مەهاباد لە گوندی دورگە دەچێتە ماڵی خوشکم . بەو هیوایە تا خەبەرێك لە من دەزانێ ماوەیەك لەوێ بێ . سەید عەزیـــزی زاوام ڕای ناگرێ . ناچار دەگەڕێتەوە مەهاباد و بە تەنیا لە خانویەك دا دەژی .

لێرەدا پەندی پێشینان چەند جوان وەراست دەگەڕێ کە گوتراوە :

" خزم و دوست و برادەر لە تەنگانەدا دیاری دەدەن "

لەو ماوەیە دا لە مەهاباد بێجگە لە چوکەڵی گەوهەری هیچ کەس نــــە پرسیاریان لێ دەکاو نە سەریان دەدا . چوکەل لە حەساری ماڵی وەستـــا عەفوری پینەچی ژورێکیان بۆ دەگرێ و خێزانم لە گەڵ منداڵێك لــــەو حەسارەدا دەژین .

کاتێك نامەکەی من دەگاتە مەهاباد برادەرانی حیزبی بە خێزانم رادەگەینن کە ئامادە بێ بچێ بۆ عێراق. پارەیەکی بۆ لە وسێن مەراغەیی وەردەگرن و بە منداڵەوە سواری ماشێن دەبێ و شەو دێتە نەغەدە . لە نەغەدە دیسان بابی ڕای ناگرێ شەوێ لە ماڵە کاك سادقی پێشنماز دەمبینێتەوە . برادەرانی نەغەدە (حەمەدی خانمی ، کاك سادق و سەعیدی - پیشنماز سدیقی عەلایی) پیاوێکی رەگەل دەخەن دەینێرن بۆ خانێ ماڵە سەید حەمەدی زەرگەتەنی . سەید حەمەد یەکێك لەو پیاوە جوامێرانەی ناوچەی پیرانان بوو . لە هەوڵی زیندوکردنەوەی رێکخراوی حیزب ببوە ئەندام و بە گیان و ماڵ تێ دەکۆشا . پیاوێکی ئاقڵ و بەرێز و لە لای خەلك قسەی دەرۆیشت . سەید حەمەد چەند رۆژێك خێزانم لە ماڵێ رادەگرێ و پاشان کوڕەکانی خۆی لە گەلێ دەنێرێ بۆ گوندی " گولاوێ " مولکی شێخ عوبیدیلای زینوێ " خێزانم لە ماڵە حەمەدەمینی زینەبێ چەند رۆژ دەمێنێتەوە . هەر چەند تۆزێك خزمایەتیمان هەبوو بەلام وەك خێزانم دەیگێڕاوە هەر ئەوەندە بوە دەریان نەکردوە . وەك ژنێکی بێ کەس و لێ قەوماو چاویان لێ کردوە. پاش چەند رۆژ خێزانم حەمەدەمین هەڵ دەپێچێ کە پیاوێك بە کرێ بگرێ و بینێرێتە زینوێ شێخی . لەو ناوەدا ماڵێکی مەڕ دار کە تاوڵیان لە گەلی حاجی برایمی پشتی کۆنە لاجان دەبێ خێزانم لە گەڵ خۆ دەبەن بۆ کوێستانی حاجی برایم .

لێرەدا ناتوانم زەحمەت و کوێرەوەری و بێ کەسی خێزانم بێنمە سەر کاغەز . ژنێکی شارستانیی غەریب، منداڵێکی شەش مانگ بە ئامێزەوە، بە چیاو کەژی کوێستانی حاجی برایم دا بروا، بێ گومان نووسین و نیشاندانی چیرۆکێکی دەوێ . چەند شەو لە کوێستان لەو ماڵە دەمینێتەوە کەس نابێ تا زینوێ شێخی لە گەلی بچێ . پاش چەند رۆژ کابرایەکی خەلکی حاجی ئۆمەران گا حوتی لێ ون دەبێ ، لە گا حوت دەگەرێ رێگای دەکەوێتە تاوڵی ئەو ماڵە کە خێزانمی لێ بوە . پێی دەڵێن ئەو ژن و منداڵە لە گەڵ خۆت بەرە بۆ زینوێ پارەیەکیشی لێ وەرگرە .

کابرا مالی ئاوەدان بێ ، بیستمەن لە خێزانم وەردەگرێ و لە گەڵ خۆی دەیهێنێ بۆ زینوێ شێخی ٠

من پێشتر نامەم بۆ کاک مستەفای کوڕی شێخ عوبەیدوللا نووسیبو کە خەبەرێك لە ماڵە سەید حەمەدی بزانێ ، ئەگەر خێزانم لەوێ بێ بنێری بیهێنن بۆ زینوێ ٠ لەو لاشەوە سەید حەمەدی زەرگەتەنی خەبەر دەنێرێ بۆ کاک مستەفا کە بە دوای دا بنێرێ ٠

لەو ڕۆژەدا خێزانم لە گەڵ کابرای حاجی ئۆمەران بەرەو زینوێ دێ کاک مستەفاش دوو سواران دەنێرێ بۆ گوندی گولاوێ بە دوای خێزانم دا ٠

نوێژی شێوان لەو دیوی ماوەت لە نێزیك بەردی تەشی ڕبێ، سوارەکان تووشی کابراو خێزانم دەبن ٠ دەپرسن ئەو ژنە کێ بەو بۆ کوێ دەچێ ؟

ـ دەچێتە زینوێ ماڵە شێخی ٠ لە تاولەکانی حاجی برایم بوە لە گەڵ خۆم هێناوە ٠

لە خێزانم دەپرسن ٠ دەڵێ خەڵکی لاجانێم و دەچمە ماڵە شێخی ٠

سوارەکان دەڕۆن پاشان بیردەکەنەوە دەڵێن بێ گومان ئەوە خێزانی کەریمی حیسامیە ٠ با بگەڕێینەوە پێی بڵێین کە بە دوای ئەودا دەچین ٠

دەگەڕێنەوە جارێکی دیکەش لە خێزانم دەپرسن : ـ ڕاستیمان پێ بڵێ ٠ ئێمە دەچین بە دوای خێزانی کەریمی حیسامی دا دەڵێن لە گولاوێیە ٠ کاك مستەفای شێخی ئێمەی ناردوە ٠ ئەگەر خۆتی، با ئەو ڕێگایەمان نەکەوێتە بەر؟ ٠ خێزانم بروا دەکات و سواری دەکەن دەچنە زینوێ ماڵی شێخ عوبەیدوللا ٠ لە ڕادە بەدەر ڕێزی لێ دەگرن و بە خێرهاتنی دەکەن ٠

برادەرێکی خەڵکی ڕایەت لە بەغدا تەلیفونی بۆ کردم :

ـ مزگێنیم دەیە خێزانت هاتوە لە زینوێ لە ماڵە شێخی یە ٠ لە گەڵ ئەحمەد توفیق بریارمان دا کە من بچم بۆ زینوی خێزانم لە گەڵ خۆم بێنمە بەغدا ٠ ئەویش بچێ بۆ سولێمانی خەبەرێکی وڵات بزانی ٠

سواری ماشێن بوم بۆ هەولێرو لەوێشەوە بەرەو زینوێ لە دەربەندی ڕایەت تووشی کاک عەبابەکر بوم ٠ عەبابەکر کادرێکی پارتی و کوڕێکی زۆرباش و

دەمێك بوو یەكترمان دەناسی • عەبابەكر كوڕێكی پێشكەوتوخـــــواز و تێگەیشتوو بوو • دانیشتین تۆزێك قسەمان كرد • ناكۆكی پارتـــــی و كۆمونیستەكان گەیشتبوە ناوچەی باڵەكانیش. هێندێك دەستی گڵاو هەبــون كە ئاگری كێشەی نێوان حیزبی كۆمونیست و پارتی دیموكراتیان خـــۆش دەكرد • بە راشكاوی بە عەبابەكرم گوت : دوژمنایەتی حیزبی كۆمونیست بە قازانجی كورد نییە • هەرچەندی پێت دەكرێ كارێكی وابكە لەم ناوچەیـــە ناكۆكی پەرە نەگرێ •

گوتی : لە تۆڵەی ئەم ئاموژگاریانە مزگێنیت دەدەمێ كە خێزانـــت و كورەكەت لە ماڵی خدری مام رەسووی بون ، چوم بەخێرهاتنم كردبـــون • دیاربوو خەبەرەكە راست بوو • یەكجار شادو كەیف خۆش بوم.

خێزانم لە گەڵ منداڵەكەی لە مانگی جوزەردانی ١٩٥٩ گەیشتبونـــە كوردستانی عێراق • چوومە زینوێ و بە دیداریان شاد بووم • لام وایە شادی حەقی خۆم بوو لە دایك و باب و منداڵ هەرچی هەم بوو ئەم دوانە بـــە سەڵت و قوڵتی نەجاتیان ببوو، ئێستا گەیشتبوینەوە یەك • چەند رۆژ لـە زینوێ لە ماڵە برادەری قەدیمی و خۆشەویستم خدری رەسوی شێخ محەمەدی مامەوە • خەڵكی زینوێ لە رادە بەدەر پیاوەتیان نواند هەر رۆژە ماڵێك بانگی دەكردین • ماڵە شێخ عوبیدوا لاش لە ماڵی خۆمان فەرزتر بـوو •

پاش چەند رۆژ مانەوە لە زینوێ ، لە گەڵ خێزانم سوار بوین بـــەرەو بەغدا •

لە كەرادە الشرقیە خانویەكمان گرتبوو خانویەكی گەورە ، حەساریكـی پر لە دارە خورماو گوڵ و سەوزایي سەگێكی لە جسنی گورگی تێدا بەجێ مابوو ، دیار بوو خانوی دیپلوماتی ئینگلیسی بوە كە پاش شۆرش چۆلی كردوە •

بێجگە لە ئەحمەد توفیق مەلا باقی عەزیزی فەلاحی و حەمەی حاجـــی سەعیدیش لەو ماڵەدا دەژیان • پاش گەڕانەوەم بۆ بەغدا ئەحمەد توفیقیش دوای چەند رۆژ لە سەفەر گەڕایەوە - بە پێچەوانەی سەفەری جارانـــــی

دم و لووتی تێك تابوو ، باسی سەفەرو کوردستانی بۆ نەگێڕاینەوە ، بە تایبەت لە گەڵ من قسەی نەدەکرد . پێم سەیر بوو ، ئێمە نێوانمان زۆر خۆش بوو . پاشان بە هۆی مەلا باقیەوە بۆم دەرکەوت ئەو نامەی من بۆ غەنی بلوریانم نووسیبوو قاسمی سولتانیان لە گەڕانەوەدا دابوی بە هاشمی حوسێن زادە کە بیدا بە غەنی . پاش ئەوەی کە من مەهابادم بەجێ هێشتبوو هاشمی حوسێن زادە ببووە بەر پرسی کۆمیتەی مەهاباد . هاشم لە جیاتی ئەوە کە نامەکەی من بدا بە غەنی ، نامەکە دەخوێنێتەوەو راست بۆ ئەحمەد توفیقی دەنێرێتەوە .

ئیتر لەو کاتەوە ئەحمەد توفیق لە گەڵ من وەك کێرد و پەنیری لێهات . رۆژانە بە تەنیا وەدەر دەکەوت دەچوە لای پارتی و لای مەلا مستەفاو شەیتانی دەکرد . لە ماڵەکەش نان و چێشتی لە ئێمە جیا کردەوە .

رۆژێك چوومە ماڵی مەلا مستەفا ، ساڵحی خوارزای مەلا مستەفا هاتە لام و گوتی : " بە خوا ئێمە تۆمان بە کوردێکی دڵسۆز دەزانی نەمان زانی بوو تۆش لە گەڵ قاسملوّ دەستەی نیژادو هەمزە عەبدوللا و شیوعیەکانی " . زۆرم پێ سەیر بوو چونکە من تاقە جارێکیش تا ئەودەم لە گەڵ ماموستا هەمزەو نیژاد دانەنیشتبوم . هیچ کەسم لە شیوعیەکان نەدیبوو . دیار بوو شەیتانی ئەحمەد توفیقە .

گوتم : کاك ساڵح من کوردێکی دڵسۆزم کەسیش لە خۆم بە نیشتمان ـ پەروەرتر نازانم . هەر کەسێکی ئەو قسەی بە ئێوە گوتوە درۆ دەکا . من بیرو باوەڕێکی پێشکەوتوخوازم هەیە دوژمنی شیوعیش نیم .

ئاخرەکەی رۆژێك رەحمانی قاسملوّ بانگی کردم گوتی با بچینە لای برایم ئەحمەد . ئەو دەم ماموستا برایم ئیتر کرابوو بە سکرێتیری پارتی و لە بارەگای خەبات حوکماتی دەکرد . لە گەڵ کاك رەحمان لای ماموستا برایم . پاش چاك و خوشێکی سارد رەحمان گوتی :

" کاك برایم ئێمە خەبەرمان داوە چەند برادەرێکمان لە ئێرانەوە بێن هەتا ئەوان دێن کەس حەقی نیە بە ناوی نوێنەری حیزبی دیموکراتی

کوردستان قسه بکات • تکایه ئێوەش یارمەتی بە توند بوونی ناکۆکــــی
نێو ئێمە مەدەن •

ماموستا برایم ئەحمەد لە وڵام دا گوتی : " ئێمە ئەحمەد توفیق بــه
نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستان دەناسین • ئێوە شەوو ڕۆژ لە گـەڵ
هەمزەو نیژاد دژی پارتی کار دەکەن ، ئێوە لە گەڵ شیوعیەکانن • بێجگـه
لە ئەحمەد توفیق ئێمە هیچ کەسی تر بە نوێنەری حیزبی دیموکراتــــی
کوردستات ناناسین "•

کاك ڕەحمان گوتی : " کاك برایم من ئەحمەد توفیقم وەك نوێنــــەری
حیزب بە ئێوە ناساندوە • ئێستاش هەر من دەڵێم کە ئەو نوێنەری حیزبی
دیموکرات نییە "•

کاك برایم گوتی : " ئێمە خۆمان باشتر دۆست و ناحەزی خۆمـــــان
دەناسین ، ئێوەش بە نوێنەری حیزب نازانین " •

هەستاین وەدەر کەوتین چوینە ماڵی مەلامستەفا ماوەیەك بوو قاسملۆ
سەری ماڵی مەلا مستەفای نەدابوو • لە پێشدا مەلا مستەفا پــرس ورای
پێ دەکرد ، زۆری خۆش دەویست ، هەر ئەو بە کاك نوری شاوێسی گوتبوو
کە لە وەزارەتی کار مەعاش بدا بە خێزانی • بەلام لە بەر هاتوو چــۆی
ڕەحمان بۆ کن ماموستا هەمزەو نیژادو خەسرەو توفیق ، وەدوزمانـــــی و
شەیتانی ئەحمەد توفیق مەلا مستەفا پشتی تێ کردبوو •

ماوەیەك لە دیوەخانێ دانیشتین پاشان رەحمان بە مەلا مستەفــــای
گوت : " ئەگەر وەختمان بدەیەی پێمان خۆشە شەوێك هەمومان لە لای تـــۆ
کۆببینەوەو باسی وەزعی خۆمان بکەین • لەولاشەوە مەلا باقی و عەزیــزی
فەلاحی و حەمەی حاجی سەعیدیش نامەیەکیان بۆ مەلامستەفا نووسیبو داوای
کۆبونەوەیان کردبوو کە مەلامستەفا بە سەری را بگا •

شەوی ١٠/٦ / ١٩٥٩ هەمومان لە ماڵە مەلامستەفا کۆبوینەوە • لــــە
پێشدا مەلامستەفا لە بارەی کوردایەتیەوە بڕێکی قسە کرد • پاشـــــان
ئەحمەد توفیق هەڵی دایە • بەڕاستی تا ئەو دەم پێم وا نەبوو مرۆڤێکـــی

تۆسقاڵێك ویژدانی هەبێ ، ئاوا راستی و شەرەف و كەرامەت بخاتە ژێر قاچی و بە ئاشكرا درۆ بكا .( بەلام ئێستا پاش بیست و پێنج ساڵ كە ئەم بیرەوەریانە دەنووسمەوە بۆم دەركەوتوە كە زۆر كەس لە سیاسەت دا درۆ ، فرو فێل ، بوختاتی بێشەرمانە بە هاوڕێ خۆی بە زیرەكی دەزانێ)
تا ئەو دەم هەر وەك گوتم تاقە جارێكیش لەگەڵ ماموستا هەمزەو نیژادو كاك رەحمان لە میواندداریش دا بەشداریم نەكردبوو . بەلام ئەحمەد توفیق گوتی : ئەو كاك كەریمە شەوو رۆژ لە گەڵ هەمزە عەبدللاو نیژاد و رەحمان كۆبونەوەی هەیە . بە محەمەدی حاجی سەعیدی گوت : ئەوە لە گەڵ شیوعیەكانەو قەتیش ئەندامی حیزب نەبوە. بە عەزیزی فەلاحی گوت : ئەوە لەخۆوە رای كردوە خۆی بە حیزبەوە هەڵپەساردوە قەت كاری بە سیاسەت نەداوە . بە رەحمانی قاسملۆی گوت ئەوە ئەندامی حیزبی تودەیە دەیەوێ حیزبی دیموكرات لە كوردایەتی بشۆرێنێ ، شەوو رۆژ لە گەڵ هەمزەو نیژادە .
مەلامستەفا كە ناوی نیژادی دەبیست تێك دەچوو ، گرژ دەبوو ، هەر غەزەبی لە نێو چاوان دەباری .
رەحمان گوتی : (راستی ئەوەیە ئەحمەد توفیق لە حیزب یاخی بوە دەمێكە بڕیار دراوە كە بگەڕێتەوە بۆ ئیران . ئەو نوێنەری حیزب نیە ،ئێمە كارو باری حیزبی خۆمان لە نیو خۆمان دا چارە سەر دەكەین . ئەو قسانەی ئەحمەد توفیق هیچی راست نین و درۆیە ).
حەمەی حاجی سەعید گوتی :
بە من دەڵێ ئەندامی حیزب نییە . بەلام من هەموو كەس دەزانێ كە لە ناوچەی سەردەشت تێكۆشانم هەبوە . حەبس كراوم . تەنانەت كاتێك ئەوانە لە چیا بون ، گیسكم بۆ دزیون كە برسی نەبن .
مەلامستەفا گوتی : (من ئەحمەد توفیق بە نوێنەری حیزبی دیموكرات دەناسم .
من گوتم : ئێمە دەبێ نوێنەری حیزب دیاری بكەین . ئەگەر وا بێ ئێمە

مەحبورین بەیانێك دەربکەین و کردەوەکانی ئەحمەد توفیق بۆ خەڵك روون کەینەوە .

کە وام گوت مەلامستەفا تورە بو گوتی : (ئەو کارە بکەن بەیانتان لە سەر دەردەکەم ، بە خائیتی کوردتان دەناسێنم ، لە عێراق وەدەرتان دەنێم ).

گوتم : کورد ئێمە بە خائین ناناسێ لە عێراق وەدەرنانیش زۆر گرینگ نییە کردەوەکانی ئەحمەد توفیق خیانەت بە گەلی کوردن .

کاك رەحمان گوتی : (کاك کەریم تورە بوە ئێمە بەیان دەر ناکەین ئێستا کە تۆ وا بڕیار دەدەی با وابێ ).

هەستاین وەدەر کەوتین. ئیتر لە گەل ئەحمەد توفیق بە جارێك پێوەندی ـ مان نەما . ئەو دەم رەحمانی قاسملۆ لە گەڵ پەروێزی حیکمەت جو ئەفسەری فرۆکەوانی ئەندامی حیزبی تودەی ئێران لە سالحیە خانویان گرتبوو پێکەوە دەژیان .

رۆژێك کاك مستەفای برای حاجی مەحمود ئاغای پشت دەری کە لە بەغدا دەیخوێندو لە گەڵ خوشکێکی دەژیا ، بۆ نان خواردن بانگی کردبوین . لەگەڵ خێزانم چوبوینە ماڵی کاك مستەفا . لای ئێواری کە گەراینەوە حیرانەکەمان گوتی : خۆ ئێوە ماڵتان لێرە رۆیشتوە کەس لێرە نەماوە. پێمان سەیر بوو کە دەچینە ژور خانوی رەق و تەق و هیچی تێدا نەماوە .

پاش چونی ئێمە بۆ ماڵی کاك مستەفا ، ئەحمەد توفیق لۆریەك بە کرێ دەگرێ و لەگەڵ مەلاباقی و یەك دوو عەمبال ماڵەکە بار دەکاو دەیبا . هەرچی لە خانوەکە دا دەبێ دەیبا . کتێبخانەیەکی زۆر باشمان هەبوو هەمووی کۆ کر دبونەوەو بردبونیە ماڵی توفیق وردی .

ئێمە بەسەر ماڵی چول و هول دا هاتبوینەوە . ژورەکەی ئێمە داخرابوو پێخەف و شتو و مەکی خۆمانی تێدا مابو. هیچ نەدەکرا ، بەیانی لەگەڵ عەزیزی فەلاحی چوینە ماڵی سەید عەزیزی شەمزینی . بە سەید عەزیزم گوت : "ئێوە لە حیاتی یارمەتی بە یەکێتی ئێمە ، بە پتەو کردنی خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران ناکۆکی ناو ئێمە قوڵ تر دەکەن . پشتی

ئەحمەد توفیق دەگرن کە بە ناوی حیزب ئابروی حیزبی دیموکرات بەرێ ٠ئێمە خانویەکی حیزبی‌مان هەبوو ، دوێنێ ئەحمەد توفیق هاتوە تا لانی کـــردوەو هیچی تێدا نەهێشتوە ٠ دیارە ئێوە پشتیوانی لێ دەکەن ٠

سەید عەزیز لە حیاتی ولام دانەوەی من زۆر بە ناحەق و بێ‌شەرمانە هێرشی بردە سەر پێشەوا قازی محەممەد ٠ ئیتر من هەستام گوتم بە هەلە چوم ٠ تـــۆ بۆیە نابێ باسی پێشەوا بکەی ٠ لەوێرا چومە مالە قاسملۆ ٠ رەحمان گوتی دەچمە لای مەلامستەفاو شتومەکی حیزبی لێ دەستێنمەوە ٠ بەلام هەر قســە بوو ئیتر ئەو لە لای مەلامستەفا قەدری نەمابوو ٠

## شپرزەیی ژیان و نەخۆشی منــــــدال

سەرباری ئەم وەزعە نالەبارە نەخۆشی کەمالی کورم لە رادە بەدەر ئێمەی پەرێشان کردبوو . لەو کاتەوە کە گەیشتبوە عێراق نەخۆش بوو، زەردو لاوازو زگ چوونی بوو، زۆر جار دەمبردە نەخوشخانەی مندالان برێك تۆزو چەنـــد حەبیان دەدایەو چاری نەدەکرا . پارەیەکی وام نەبوو کە بیبەمە لای دوکتور داوو دەرمانی تەواوی بۆ بکرم . رۆژانە بە روتی لە حەسارەکە دەسوڕاوە . هەرچی لە عەرزی دیتبای لە زاری دەنا . رۆژێك مێرولەیەکی گەورەی دەس دابویەو بۆ زاری بردبوو . مێرولەکە بە لێوی دا نوساو گەستی . کەمــــال زیڕاندی و بە زەحمەت مێرولەمان لە لێوی کردەوە . حودا خێری بنووسێ لەو کاتەوە ئیتر هیچ شتێکی لە سەر زەوی هەڵ نەدەگرتەوە .

شایانی باسە لەو دەمەدا دوکتۆر فەرمیدونی کەشاورز ئەندامی پێشــوی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی تودەی ئێران لە یەکیەتی سوڤیەتی هاتبوە دەر و لە بەغدا گیرسابۆوە . بە هۆی مەلامستەفاوە کرابو بە پەنابەری سیاســـی و

سەرۆکی نەخۆشخانەی منداڵان بوو لە بەغدا ٠ مانگێ ٣٠٠ دینار مەعاشی وەردەگرت ٠ ڕێبەرایەتی حیزبی تودەی بە خەیانەت و بە ترسەنۆك تاوانبار دەکردو خۆشی بە پاك و شۆڕشگێڕو دڵسۆزی گەلانی ئێران دادەنا ٠ نامەی سەر ئاواڵەی بۆ ئەیزینهاویر سەرکۆماری ئەمریکا دەنووسی ٠ دژی ڕێبەرایەتی حیزبی تودە قسەی دەکرد و خەریك بوو چەند کەسێك لە خۆ کۆ کاتەوەو شتێك پێکەوە نێ ٠ هاتوو چۆی مەلامستەفای زۆر دەکردو ئەویش لە ناکۆکی نێوان مەلامستەفاو حیزبی کۆمونیستی عێراق دا دەوری ناپاکی خۆی گێرابوو٠

چەند جار کەمالم بردە لای تەماشای دەکرد و دەرمانی زۆری بۆ دەنووسی ٠ ڕۆژێك پێم گوت : دوکتۆر من پارەم نییە ناتوانم ئەو دەرمانانە بکڕم ٠ لە وڵام دا گوتی : " من دەرمان دەنووسم هیچی دیم پێ ناکرێ " ٠

تەنانەت ناچار بوم بۆ کڕینی ئەو دەرمانانەی کە فەرمیدونی کەشاوەرز بۆ منداڵێکی کوردی ئێراتی نووسیبوو داوای پارە لە میرحاج بکەم و پێنج دیناری لێ وەربگرم ٠

ڕۆژێك منداڵەکەم بردبوە نەخۆشخانەی منداڵان لە باب المعظم ٠ لە گەڕانەوەدا بۆ کەڕادە شازدە فلوسم نەبوو کە سواری ئوتۆبوس بم ٠ ماڵەکەی ئێمە زۆر دوور بو ، بە گەرمای بەغدا و بە منداڵەوە نەدەگەیشتمەوە ٠ سواری ئوتۆبوس بوم و منداڵەکەم لە سەر کۆش دانا ٠ زۆری پێ نەچوو جابی هاتو داوای پارەی بلیتی کرد کە شازدە فلوس بوو٠

گوتم : دەبێ ببەخشی پارەم نییە ٠

ـ نابێ ٠٠٠ پارەت نییە وەرە خوارێ ٠

ـ نایەمە خوار ٠٠٠ منداڵێ نەخوشم پێیە ٠٠٠ بەو گەرمایە دەمرێ ٠

کابرا دەستی هەڵ نەدەگرت ٠ عەرەبێك لە پەنا من دانیشتبوو گوێی دابوە دەم بە دەمەی من و کابرای بلیت فرۆش ٠ لە کابرا دەر هەڵ بوو ٠ دینارێکی هێنا دەرێ بە سینگی کابرای دادا و گوتی : " بگر، لەعنەت لە خۆت و لە شازدە فلوست و لە جمهوریەتو لە دارالسلامت ٠ (ئەو دەم بە بەغدایان دەگوت

دارالسلام ) • شەرم ناکەی دەڵێی دابەزە • ئەو پیاوە ئەگەر پارەی هەبێ چۆن دەڵێ شازدە فلوسم نیە • گوێری ئەو منداڵە نەخۆشە نابینی )•

کابرا دەستی هەڵگرت و منیش بە منداڵی نەخۆشەوە گەیشتمەوە ماڵێ• ئەو باسە لێرەدا بۆیە پێویست بوو، لە کاتێك دا پارتی " طلیعةالشعب ـ الکر دی ) وەزیری لە دەولەت دا هەبوو ، ئەحمەد توفیق وەك نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێر ان سەرو بنی عێراقی راو دەکردو شەوو رۆژ دەستی لە گەڵ مەلا مستەفاو مودیری ئەمنی عام بو، رەحمانی قاسملۆ وەك رێبەری حیزبی دیموکرات و نوێنەری حیزبی تودەو ماموستای زانستگا ، دوکتۆر فەرەیدونی کەشاوەرز وەك تێکوشەری ئێرانی و سەرۆکی نەخۆشخانەی مندا لان ، مەلامستەفاش وەك سەرۆکی هەموو کوردی چارە رەشی دنیا لە بەغدا کۆ بیوونەوە ، ئەمە نموونەی ژیانی کوردیکی تێکۆشەر ولێقەوماو بووپاش بیست ساڵ تێکۆشانی سیاسی و حەبس و دەربەدەری •

رۆژێك چوومە ماڵی قاسملۆ باسی وەزعی شپرزەیی خۆمانم کردو گوتم: ئاوا ناژیم و دەبێ کارێک بدۆزمەوە • رەحمان گوتی ناتوانی کاربدۆزییەوە •با بزانین مانگێ بە چەندی بەرێ دەچن ئێمە دەتان دەبینێ • خوشکە نەسرینی خێزانی قاسملۆ قەلەمی دەست دایەو دەستی کرد بە نووسین : رۆژێ دەبێ چەند نان بخۆین ، حەوتوی چەند جار گۆشت بخۆین لە گەڵ وردە شتی دیکە بە گەورەیی و بە سەخاوەتی خۆی کەیاندیە مانگی دوانزدە دینار • بەو حیسابە دەبوایە من و خێزانم و منداڵێك رۆژی بە چوارسەد فلوس بەرێ بچین • دیارە عەزیزی فەلاحیش بێ کارو بار دەسوراوەو ببوە سەرباری ژیانی ئێمە •

من ئەو دەم ئەم بریارەی رەحمانی قاسملۆم پێ هەنگاوێکی گەورەو پیاوەتیەکی مەزن بوو • نەم زانی بو کە قاسملو بە ناوی کاری حیزبی و بە ناوی یارمەتی بە ئێمە پارەی لە دوکتۆر رادمەنیش سکریتێری حیزبی تودە وەر گرتبوو • پێم وابوو لە گیرفانی خۆی ئەو پارەمان دەداتێ و زۆریشی لێ ممنون بوم •

دیاربوو بە دوازدە دینار ئێمە نەدەژیاین گەلێک ڕۆژ بە نانی ویشک و خاڵی دەمانبردە سەر . ناتوانم ئەوەی بشارمەوە کە گەلێک ڕۆژان لە ساحةالنصر دەچووم لە لای جگەر فرۆشێک سەمونێکم دەخوارد، پارەم نەدەداو دەڕۆیشتم . جاری وا هەبوو سەمونەکەم بە جگەرەوە بۆ ماڵێ دەبردەوە .

لەم ناوەدا چوومە لای کاک حەسەنی قزلجی کە لە کن وەستا برایمی وێنەگر کاری دەکرد کاک حەسەن نامەیەکی بۆ نووسیم و داوای پەنابەری سیاسیم کرد . بە گوێرەی یاسای تازەی کۆماری عێراق ئەوانەی بە تاوانی سیاسی لە و لاتی خۆیان دەربەدەر ببون ، دەیانتوانی لە عێراق داوای پەنابەری بکەن و حکومەتی عێراقیش پەنایان دەدا . نامەکەم دا بە وەزارەتی نێو خۆی عێراق و بە ئیدارەی ئەمن . ئادرێسی خۆم ماڵە مەلامستەفای بارزانی دابوو . ژمارەیەکیان دامێ و گوتیان برۆ پاشان لێت دەگێڕینەوە .

لێرە دا ناکرێ پیاوەتی و جوامێری کوردێکی ئێرانی بە ناوی بێچان کە لە گەڵ مەلامستەفا چووبوە یەکێتی سۆڤیەتی و گەڕابۆوە بۆ عێراق لە بیری بکەم . ئەو پیاوە زۆر جار یارمەتی دەداین . خێزانی کە ژنە روسێک بوو ڕۆژێک هات و خێزانمی لە گەڵ خۆی بردە شۆرزدیباك و جلی تەواوی بۆ کڕیبوو .

## لە ئێران چ باس بوو

سمایلی قاسملۆ کە خوێندکارێکی زانستگا بوو ، هاتبوە کۆڕی تێکۆشانی سیاسی و کادرێکی لێهاتو تێکوشەری حیزبی و دۆستی نێزیکی ئەحمەد توفیق بوو. ساڵی ١٩٥٩ لە عێراقەوە بۆ تێکۆشانی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و لە ناوچەی بانە دەگیرێ.

سمایلی دەبەنە شاری بانە لەوێوە دەیبەن بۆ تاران. سمایل نەك هەر هەرچی دەیزانێ دەیڵێ و ئیقرار دەکا ، بەڵکو لەگەڵ مەءموری ساواك دێتەوە کوردستان و تەواوی ڕێگاو بانی هات و چۆی کادرەکانی حیزبی و ماڵی ئەندامان و حەشارگەی کادرەکان بە ساواك نیشان دەدا. سازمانی ئەمنیەتی ئێران پاش ئەوە کە لە هەموو نەخشەو تێکۆشانی ڕێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات شارەزا دەبێ و ئەندامان دەناسی ، لە مانگی خەزەڵوەری ١٩٥٩ پەلامارێکی توندو بەر بڵاو بۆ سەر ڕێکخراوەکانی حیزبی دیموکرات دەس پێ دەکا. سەرهەنگ ئەمجەدی و سەرهەنگ زیبایی دوو جەلادی بەناو بانگی سازمانی ئەمنیەت سەرۆکایەتیی ئەو هێرشەیان لە کوردستان پێ دەسپێردرێ. لە سەرانسەری کوردستان لە شارەکانی سنە ، بانە ، سەقز ،

بۆکان ، سەردەشت ، خانێ ، مەهاباد ، میاندواو ، ساین‌قەلا ، نەغەدە، شنۆ، ورمێ ، شاپور ، دەس دەکەن بە ڕاو نان و گرتنی ئەندامان و لایەنگرانـــی حیزبی دیموکرات و نێزیکەی دووسەد و چل کەس دەگرن و بۆ بەندیخانەکانی تەوریز و تارانیان دەبەن • ئەشکەنجەو ئازارو داخ کردنی ئەو ڕۆلانە لـــە نووسین نایەو هەر دەبێ لە زمانی خۆیانی ببیسین •

لە گەڵ ئەو هێرشە سەدان کەسیش لە ئەندامانی حیزب بۆ ئەوەی لە دەس سازمانی ئەمنیەت نەجاتیان بێ ڕایان کردو ڕویان کردە کوردستانی عێراق• ئەم کارە ساتە دڵ تەزێنە دەرفەتی پتری بۆ هەڵسوڕان و جم و جۆلی ئەحمەد۔ توفیق پێك هینا • بە تەنیا بە ناوی حیزب بەیانی بڵاو دەکردەوە• ئاوارەکا۔ نـی کە رویان کردبووە کوردستانی عێراق لە سولێمانی گلی دابونەوەو بە نێوی کۆمون لە خانویەك دا دەژیان و سیستمێکی پۆلیسی بە سەر دا زاڵ کردبون • نەی دەهێشت هیچ کەسیان لە سولێمانیەوە بۆ بەغدا و شارەکانی دیکەی کوردستان سەفەر بکا • تەنانەت دەبوایە بۆ نێو شاری سولێمانیـــش ئیجازە وەربگرن •

لێرەدا ناکرێ پیاوەتی و چاکەو هاودەردی و جوامێری خەڵکی سولێمانی لە بیر بکەین • ئەوەی خەڵکی سولێمانی دەگەڵ لێ قەوماوەکانی حیزبـــی دیموکراتیان کرد لە وزەی پێ نووسی من دا نیەو هەر دەبێ لە حاـــــت ئەوانەوە کۆرنۆش بەرین •

لەم ناوەدا هێندێك لە کادرەکانی حیزبی بە تـهێنی نامەیان بۆ مـــن نووسی و داوایان کردبو کە بچمە سولێمانی لە سەر ئەم وەزعە شپرزەیـــە راوێژو تەکبیر بکەین • من دەرەتانی سەفەرم نەبو پسولەیەکم بە دەستەوە نەبوو کە بتوانم سەفەری پێ بکەم • چومە لای کاك رەحمانی قاسملۆ گوتـم: ئەو برادەرانە کە دەربەدەر بون ئێستا هەموویان لە سولێمانی کۆ کراونەوە، ئەحمەد توفیق رێگایان نادا کە سەفەر بکەن یان نامە بنوسن یــــان رێ و شوێنێك بۆ کاری سیاسی دابنێن • زۆر پێویستە بچیە سولێمانـــــی سەرێکیان لێ بدەی قسەیان لەگەڵ بکەی بۆ بەرێوە بردنی کاروباریـــــان

کۆمیتەیەکیان بۆ پێك بێنی ٠

کاك رەحمان یەك دوو رۆژ خۆی بواردو پاشان هەستا چوە سولێمانی ٠ پاش بور برادەرانی حیزبی کۆمونیستی عێراقی لە سەفەری خۆی ئاگادار کردبوو ٠ لە سولێمانی چوبوە هوتێلێك ، برادەرانی حیزبی کۆمونیست بە جێگایان دەزانی ٠ ئەحمەد توفیق وەك جندوکە لە بیسمیلا بترسێ شاوا لە پێوەندی ئێمە لە گەڵ ئەو برادەرانە دەترسا ٠ هەمیشە چەند کەسی دەست و پێوەندی خۆی دەنارده نێو شار کە بزانێ من یا کاك رەحمان چوین بۆ سولێمانی یان نا ٠ یان ئەگەر یەکێك لە برادەران بە ئیجازەی ئەو دەهاتە بەغدا ، جاسوسێکی وەدوا دەخست کە بزانێ داخوا لە گەڵ ئێمە پێوەندی هەبوە ، چاوی بە ئێمە کەوتوە یان نا !

ئەسعەدی خودایاری کادرێکی تێکۆشەرو فیداکارو ژیری حیزب بوو بە قوربانی ئەو دڵ پیسی و ترسنۆکیەی ئەحمەد توفیق ٠ ئەسعەد پاش سێ سال زیندانی کە ئازاد کرا ، خەریکی کاسبی بوو هاتوو چۆی عێراقی دەکرد بۆ کاسبی ٠ هەموو جارێ کە سەفەری دەکرد دەچوو سازمانی ئەمنیەتی ئاگادار دەکرد ٠ بەڵام هەموو جاریش دەهات بە منی دەگوت کە چۆتە سازمانی ئەمنیەت و ئیجازەی سەفەری لێ وەرگرتون ٠ هەروەها چۆنیەتی ئەم پێوەندی یەی بە غەنی بلوریانیشی رادەگەیاند ٠

پاش پەلاماری سازمانی ئەمنیەت ئەسعەدی خودایاریش رادەکاو دێتە قەلادزەو ناچێتە نێو کۆمۆنی راکردوەکانی سولێمانی ٠ ئەسعەد هاتە بەغداو چاوی بە من و بە کاك رەحمان کەوت ٠ لە گەرانەوەدا بۆ ناوچەی قەلادزە ، ئەحمەد توفیق لە گەڵ چەند کەس دارودەستەی خۆی وەدوای دەکەوێ و ئەسعەد دەکوژن ٠ وەك بڵاو بۆوە خەریك بون کە قاسمی سولتانیانیش بکوژن ، بەڵام وەك دەیانگوت مام جەلال لە فریای هاتبو نەجاتی دابو٠

کاتێك ئەحمەد توفیق دەزانێ کە رەحمانی قاسملۆ چۆتە سولێمانی و لە هوتێلە ، سولێمانی موعینی دەنێرێتە لای تا بزانێ لە چی دەگەرێ و بۆ هاتۆتە سولێمانی ٠ بە داخەوە ئەو دەم سولێمان کەوتبوە داوی

ئەحمەد توفیق و لە قسەی ئەو دەرنەدەچو • دەچێتە لای کاک رەحمان و دەس بە قسان دەکا • تۆزێکیش دژی تەك رەوی ئەحمەد توفیق دەدوێ • کـــــاك رەحمان دەڵێ هاتوم برادەران ببینم و قسەیان لەگەڵ بکەم و بزانـــــم چ دەکەین • سولێمان دەڵێ : زۆر کارێکی باشە بەیانی ئێمە چاوەڕوان دەبین کە بێیە کۆمون و قسە بۆ برادەران بکەی • لەولاشەوە دەچێ قسەکان بۆ ئەحمەد توفیق دەگێڕێتەوە • ئەحمەد دەکەوێتە ئاژاوە نانەوەو هان دانی برادەران بۆ بەگژ داچونی قاسملۆ ئامادەیان دەکا •

ڕۆژی دوایی کاك رەحمان هەڵ دەستێ بە تەنیا دەچێ بۆ خانوی برادەران کە بە ناوی کۆمۆن لەوێ دا دەژیان • پێشتریش ئەحمەد توفیق هەمووی بـــۆ کۆبونەوە ئامادە کردون • کاتێك کاك رەحمان دەچێتە ژور، پێش ئەوە کـــە دابنیشێ و بە خێرهاتن بکا ، ئەحمەد توفیق راست دەبێتەوەو دەڵێ :

" کاکە • براینە ،ئەو کەسەی ئێوەی توشی ئەو ڕۆژە کردوە، براو دۆســـت و خزمی ئێوەی بە گرتن داوە، ئەوەتا لە بن دەستانە • جا دەڵێن چی و چـــی لێ دەکەن خۆتان دەزانن " • هێندێك لەو کەسانەی ساویلکـــــــەو تێ نەگەیشتوو ، راست دەبنەوەو دەس دەکەن بە هەراو بە قسەی ناحەز بە قاسملۆ • کاك رەحمان کە وا دەبینێ هەلدەستێ کە وەدەر کەوێ ، پێشی پێ دەگرن و دەڵێن : ناهێڵین بڕۆی هەروا بە هاسانی نەجاتیت نابێ • چەنــد کەس لە برادەران دەڵێن : ئەوە کاری حیزبی نیەو ئێمە دەبێ دانیشیـــن گوێ بۆ قسەکانی رابگرین بزانین دەڵێ چی •

لەم چەقەو هەرایەدا دوو برادەری ئەندامی حیزبی کومونیستی عێـــراق دەگەنە ئەم خانووە • ئەوان بەیانی زوو دەچنە هوتێل سەری کاك رەحمـــان بدەن • خاوەن هوتێل دەڵێ چۆتە کۆمۆن بۆ لای برادەرەکانی • ئیتـــــر وە شك دەکەون و بە گورجی دەچن بۆ کۆمۆن •

لە پێشدا ئەحمەد توفیق دەرکەوان دا دەنێ کە نەهێڵن کەس بچێتـــە ژورێ • کابرای دەرکەوان پێشیان پێ دەگرێ و دەڵێ : " کۆبونەوە هەیــە نابێ کەس بچێتە ژور " ئەوان گوێ نادەنێ وەژور دەکەون • کاك رەحمان

لە گەڵ خۆیان دەبەنە دەرو نەجاتی دەدەن . ( ئێستا کە ئەم بیرەوەریانـە دەنووسمەوە ، بیر لەوە دەکەمەوە ئەگەر ئەو برادەرانەی حیـزبـی کۆمۆنیستی عیراق نەبان ، خوا خێریان بنووسیٚ ، ئێستا ئیتر کـەس نەبوو لە کوردستان بۆ دیموکراسی و خودموختاری خەبات بکا!) .

کاك رەحمان گەڕاوە بۆ بەغداو گوتی : ( ئەگەر برادەرانی حیزبـی کۆمۆنیست نەبان بیٚ گومان تەمای کوشتنیان تیٚ کردبوم و لە بەینبـان دەبردم . پاش گەڕانەوەی کاك رەحمان لە سولیٚمانی ئەوانەی لە کۆمـۆن کۆ ببوونەوە کۆمیتەیەك لە پێنج کەس پێك دێنن کە بێتە بەغدا لە گـەڵ من و کاك رەحمان قسە بکا . ئەندامانی کۆمیتە بریتی بون لـە سولیٚمانی موعیقی ، ئەحمەد توفیق ، عەولای عیزەت پور ، یوسفـی ریٚزوانی و رەشیدخانی کیوەرۆ . ئەوانە هاتنە لای من بەلام ئەحمـەد توفیق یان لە گەڵ نەبوو . گوتیان کۆمیتەیەکمان پێك هێناوە کە لـەم ناکۆکیە بکۆڵێتەوە . گوتم : ئەگەر دەسەڵاتی ئەوەتان هەیە تاوانبار سزا بدەن ، ئەحمەد توفیقیش ئامادە دەکەن لە کۆبونەوەدا دانیشیٚ ئامـادەم لە سەر ئەساسی ئەو نامەیە کە بۆ غەنی بلوریانم نووسیوە هاوکاریتـان بکەم . ئەگەر تەنیا هاتون لە من بکۆڵنەوە بە خاوەن سەلاحیەت و نازانم . گوتیان دەڕۆین پاشان دێینەوە لات . رۆیشتن بەڵام قەت نەهێتنەوە . پـاش گەڕانەوەی قاسملۆ لە سولیٚمانی سازمانی ئەمنیەتی عیٚراق بە کـاك رەحمانی راگەیاند کە دەبیٚ لە ماوەی چەند رۆژدا لە عیٚراق وەدەرکەویٚ . دیارە رەحمان خۆی بۆ رۆیشتن ئامادە کردبوو . بلیتی فڕۆکەی کڕیبو ، بیٚ ئەوەی رۆژی سەفەری بە من بڵیٚ .

ئەحمەد توفیق کە هاتبوە بەغدا ، بێجگە لە ئەندامانی کۆمیتە چەنـد کەسی دیکەشی لە گەڵ خۆ هێنابوو . شەو دەچێتە سەرماڵی قاسملـۆ داوا دەکەن دەرگایان لیٚ بکاتەوە ، کاك رەحمان کە دەبینیٚ بەو تیوە شـەوە گارانێك لە دەرگا دەدەن و دەیانەویٚ بچنە ژورەوە دەرگایان لیٚ ناکاتەوە . ئیتر بەیانی دەچێتە فڕۆکەخانەو رۆژی یەکی مارسی ١٩٦٠ لە گـەڵ

خێزانی سواری فرۆکە دەبن و بەرەو پراگ پێ تەختی چیکوسلواکی تــــێ دەتەقێنن ٠ پاش ڕۆیشتنی قاسملۆ کەمال مەزهەر بە ناو و نیشانی (بۆچی مەقالەیەکی لە سەر دەرکردنی قاسملۆ لە ڕۆژنامەی ژین دا بلاو کردبۆوە)٠

هەر ئەو ڕۆژە دوای ڕۆیشتنی کاك ڕەحمان لە ماڵەوە دانیشتبوم و ئاگام لە سەفەری ئەو نەبوو٠ دیتم پەروێزی حیکمەت جۆ ، کە لە گەل کاك ڕەحمان دەژیاو پێکەوە خانویان گرتبو ، لە میوان داری و ڕابواردن دا پێکەوە بــون، لە تاران دۆست و هاورێ و یەکتر بون و هەردوکیان پێوەندیان بە ڕیبەرایەتی حیزبی تودەوە هەبوو لە ماڵێ وەژور کەوت ٠ گوتی ڕەحمان ڕۆیشت هــەر بە توشی ڕانەگەیاند ٠ دوکتۆر ڕادمەنیش هەزار دۆلاری بۆ ناردبو کە بیــدا بە ئێوە بو خەرجی ژیان ٠ (ئەو دەم چوکەلی گەوهەری و ماموستایەکـــی سەردەشتی بە ناوی یوسفی ئەنوەری برادەرێکی ئازربایجانی و عەزیـــزی فەلاحی و حەمەی حاجی سەعیدی کە نەچوبونە لای ئەحمەد توفیق لە بەغدا بون زۆر جار دەهاتنە لام و جارو بار ئەگەر شتێك هەبا پێکەوە دەمانخوارد) پەروێز گوتی ڕەحمان بە تۆی نەگوتوە کە پارەتان بۆ هاتوە هیچیشی بــۆ بەجێ نەهێشتوز ٠ نامەیەك بنوسە بۆ ڕادمەنیش من بۆی دەنێرم٠

کاتێك پەروێز ئەوەی گوت کەوتمە نێو گێژاوی فیکرو سەرم لە چەنــد مەسەلە سور مابوو :

یەکەم هەلوێست و فرو فێلی قاسملۆ ٠ ئەو جارێك بەمنی گوتبوو کە نامەم نووسیوە بۆ ڕادمەنیش کە پارەیەکمان بۆ بنێری ٠ بەلام پاشان قـــەت نەیگوت کە پارەم بۆ هاتوە ٠ ئەو دوازدە دینارەی مانگانە دەیدا بە ئێمــە پێم وابوو لە گیرفانی خۆی دەیداتێ ٠ چەند ڕۆژ پێش ڕۆیشتن پەنجـــا دیناریشی دابوومێ کە فرە مەمنونی بووم ٠

دوهەم هەلویست و ناڕاستی پەروێزی حیکمەت جۆ ٠ ئەو زانیبوی ئـــەو پارە هاتوە لە گەل کاك ڕەحمان شەوو ڕۆژ پێکەوە دەژیان ٠ بەلام جارێــك بە منی نەگوتبوو کە ڕادمەنیش پارەی بۆ ناردون ٠

سێهەم ئەو برادەرە لە کۆنەوە لە گەل قاسملۆ دۆستی گیانی بوو، لە بەغدا

دەستیان لە گەڵ دەستی یەك بوو، بەڵام هەر لەگەڵ کو قاسملو ڕۆیشت ،
پاش ملە دەستی کرد بە غەیبەت و هاتبوو منی هان دەدا کە نامە بۆ
رادمەنیش بنووسم و دژی قاسملو وەخۆ کەوم . لەوانە سەیرتر ئەوە بوو
کاتێك دادەنیشتین باسی مارکسیزم و ئەخلاقی شۆڕشگێڕی و نەخشەی
شۆڕش لە ئێران خانوی پڕ دەکرد.

بە پەروێزم گوت : " زۆر عەیبە تۆ ئێستا ئاوا باسی رەحمان دەکەی.
ئێوە دۆستی قەدیمین . پاشان بۆچی لەو ماوەیەدا کە رەحمان لێرە بوو
جارێك باسی ئەم پارەت نەکرد . جارێك لە ژیانی منت نەپرسی . ئێستا کە
رەحمان ڕۆیشتوە هاتوی من هان دەدەی کە دژی رەحمان بنووسم ؟ من نامە
بۆ رادمەنیش نانووسم ، هیچ پێوەندیم بە رادمەنیشەوە نیە ، ئەو پارەی داوە
بە رەحمان رەنگە هەر بەشی بلیتی فڕۆکەی کردبێ ".

گوتی : " ئیتر لەو سەعاتەوە هاتوو چۆت ناکەم . عەلائەدینێکیشت لە
ماڵە رەحمان هێناوە ، ئەوە هی منەو دەبێ بم دەیەوە ".

ـ هاتووچۆ دەکەی ناکەی حەمەندەم ، گوێ بە نوری چراکەشت فەرموو هەڵی
گرەو بڕۆ.

پەروێز عەلائەدینی هەڵگرتوو وەدەر کەوت . ئێمە بێ چرا ماینەوە .

## کۆمۆنی سولێمانی

زۆری پێ نەچوو ئەوەی لە سولێمانی بە ناوی کۆمۆن ساز کرابوو لە بەر یەك
بلاو بوو . هێندێ لە هەلاتوەکان گەرانەوەو خۆیان تەسلیمی حکومەتی
ئێران کردەوە ، هێندێ لە شارەکانی عێراق بلاو بوون . عەولای عیزەت پورو
یوسفی رێزوانی هاتبوونە بەغدا پەروێزی حیکمەت جو یارمەتی پێ دەکردن
و خەریك بوو بیان نێرێتەوە ئێران و رێکخراوی حیزبی یان پێ زیندو
بکاتەوە ئاخرەکەشی هەر عەولای عیزەت پوری ناردەوەو لە ئێران گیرا.

لەو ماوەیەدا حەسەنی عەردەهالی برادەرێکی ئازەربایجانی کە پێکەوە

ماوەیەك لە زیندان بوین رای کردبوو هاتبوە عێراق و لە بەغدا لە ماڵی ئێمە گیرسابۆوە • لە باری بەرێچونەوە وەزعی ژیانمان باش نەبوو، بەلام لە باری روحی و هاوفیکری و هاودەردی و برایەتی زۆر رێك بوین وخۆشمان رادەبوارد •

لە بیرمە رۆژێك لە گەڵ حەسەنی ئەردەهالی بە شەقامی ئەبونەوازدا دەرۆیشتین گوتمان با ماسی‌یەك بکرین و بی‌بەینەوە بیخۆین• چوینە سەر ماسی کابرای ماسی فرۆش گوتی بە دینارێك • ماسی‌یەکی باش بوو• گوتم حەسەن پارەکەی بدەیە با برۆین • حەسەن تۆزێك راما دیاربوو دیناری بە پارەی ئێران ورد دەکردەوە • ئەودەم دینار بیست و چوارتمەن بوو • لە ئێران شتی وای نەدیبوو گوتی : " ئەمە من‌نەجە یرمی دویرتمەن با لفە ویرم " واتە " کورە من چۆن بیست و چوارتمەن بە ماسی بدەم "•

ــ وردی مەکەوە ٬ بیست و چوارتمەن نیە ، دینارێکە بیدەو برۆین "•

زۆر پێکەنین • حەسەن پارەکەی دا و رۆیشتین •

داخی لەوە گرانتر ئەوە بوو کە زۆر لە برادەرانی حیزبی کە ئاوارە بیون دەهاتنە لام ، نامەیان بۆ دەنووسیم داوایان دەکرد رێگایەك بدۆزمەوە و تەنانەت لە باری بەرێچوون و ژیانەوە داوای یارمەتیان دەکرد• منیش هیچم لە دەست نەدەهات • لە بەغدا بەسترابوومەوە ، سەفەرم پێ نەدەکرا • چاوەروان بووم کە بریاری پەنا بەری سیاسیم بدرێ لە عێراق قبوولم بکەن، ئەو دەم تۆزێك دەستم بکرێتەوەو بتوانم هەڵسوڕێم •

رۆژێك خەبەریان دامێ کە کۆمیسونی پەنابەرانی سیاسی کۆبۆتەوەو پێویستە ئامادە بی • بە هەڵکەوت لە گەڵ کابرایەکی خەڵکی قەرەقشلاخی شارویران لە کۆمیسیون ئامادە بوین .ئەو کابرایە بە ناوی ئەحمەد شایی‌چان چاپەزی کا وسێنی ئاغای قەرەقشلاخی بوو• لام وایە سالی ١٩٤٩ بوو خەبەر بڵاو بۆوە کە ئەحمەدی چا پەزی کاوسێنی چوارهەزارتمەنی دزیوەو هەڵاتوەو • ماوەیەك بە دوای دا سورانەوە بێ شوێن بوو • ئەحمەد پارە دەباو دەچێتە تاران • لەوێ دەبێتە گروبانی ئەرتەشی ،ژنێکی فارس

دەخوازێ. ساڵی ١٩٥٨ سی هەزارتمەن پارە دەدەن بە ئەحمەد کە بی بات بۆ ئیدارەیەکی حکومی. ئەحمەد وەك پیاوان پارەو ژنەکەی هەڵ دەگرێ و دێتە عێراق و لە گوندی خەلان لە ماڵی شێخ عەلائەددین دەگیرسێتەوە. ماوەیەك لەوێ دەبێ ، پاشان کورەکانی شێخی دەیهێننە بەغداو داوای پەنابەری سیاسی بۆ دەکەن.

کۆمیسیونی پەنابەری سیاسی کە لە سێ کەس پێك هاتبوو بانگی کردمە ژوورێ و لە بارەی ژیان و خەبات و رابردووی سیاسی من پرسیاری زۆریان کرد. منیش ئەوەی دەمزانی و ئەوەی بە سەرم هاتبوو بەڕاستی بۆم باس کردن. پاش من ئەحمەدیان بانگ کرد. پاشان هەر یەك ژمارە یەکیان دابنێ و گوتیان پاش حەوتویەك لە ئەمنی عێراق سەر بدەنەوە. کاتێکی چوومە ئەمنی عێراق دیتم ئەحمەد بە پەنا بەری سیاسی قبووڵ کرابوو. بە منیان گوت تۆ قبوڵ نەکراوی پێویستە لە عێراق وەدەر کەوی.

گەڕامەوە چوومە ماڵی مەلا مستەفا. بە مەلا مستەفام گوت: " پەنابەری من رەد کراوەتەوە. پۆلیس گوتویە دەبێ لە عێراق بچمە دەر. ئەگەر دەرم بکەن جیگام نییە دەبێ بچمەوە ئیران. مەلا مستەفا گوتی: چۆن شتی وا دەبێ خەتای خۆتە. بانگی کرد ماشێنیان بۆ هێناو سوار بوو منیشی سوار کرد و بۆ ئەمنی عام. لە رێگا گوتی: " ئەتو بۆچی... قاسملۆ خائینە ، هەمزە خائینە ، نیزاد خائینە تۆ چت لە قاسملۆ داوە ".

گوتم من قەت لە گەڵ هەمزەو نیزاد نەبووم. مەسەلە قاسملۆ نییە ، ئەحمەد توفیق لە رێبازی حیزبی ئێمە لای داوە. تۆ پشتی دەگری. ئەگەر بۆیە لە گەڵم دێی تا لە گەل ئەحمەد توفیق هاوکار بم ، زۆر سپاست دەکەم تەشریفت نەبە. ئەوەی ئەحمەد توفیق دەیکا کوردایەتی نییە ، بە زیانی کوردە. لە گەڵ بیرو باوەڕی من نایەتەوە ".

هیچ قسەی نەکرد تا گەیشتینە ئیدارەی ئەمن. پێشوازیان لێ کرد راست چوینە لای عەبدوالمحید مودیری ئەمنی عام. مەلا مستەفا گوتی:

" لە بەر سالح هاتوم. کۆمیسیونی پەنابەری قەبوڵی نەکردووە. ئەوە ج

ئەوە ج کۆمیسیونێکە ، من سالّحم ناساندوە ، چۆن دەری دەکەن ؟
مودیری ئەمن گوتی : " شتی وا نابێ ، خاتر جەم بە من بۆ خۆم دەچم بۆ وەزارەتی داخیلە ، خاترجەم بە جێ بەجێی دەکەم " . گەڕاینەوە .
ڕۆژی دوایی نامەیەکم بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق نووسی و لە هەڵوێستی پارتی سەبارەت بە حیزبی دیموکراتی کوردستان و پشت گیری لە ئەحمەد توفیق ڕەخنەم گرت . هەروەها لە نامەکەدا داوام لێ کردن کە کارێکی وا بکەن لە عێراق دەرنەکرێم و بەێننەوە .
دوای ڕۆژێك کاك عەلی عەبدوللا تەلیفۆنی لێ کردم کە بچمە بارەگای پارتی . کە چووم لە ئیدارەی ڕۆژنامەی خەبات دوکتۆر مراد عەزیز و عەبدوالرحمنی زەبیحی دانیشتبون چاوەڕوانی من بوون . مام جەلال لە گەڵ چەند کەسی دیکە لەولاتر دانیشتبون .
زەبیحی گوتی : " نامەکەت لە مەکتەبی سیاسی خوێندراوە . من و دوکتۆر مراد هاتوین لە لایەن مەکتەبی سیاسیەوە قسەت لە گەڵ بکەین.
ـ فەرموو قسەی من هەر ئەوەندەیە کە ئێستا ئێوە لە حکومەت دا بەشدارن وەزیرتان هەیە ، بۆ ئێوە عەیبە کە من لە عێراق دەر بکرێم . ئەوە بیست ساڵە لە حیزبی دیموکرات دا تێ دەکۆشم .
گوتیان ئێمە ئەحمەد توفیق بە نوێنەری حیزب دەناسین .
گوتم ئەحمەد توفیق نوێنەری حیزب نیە ، لە ڕێبازی حیزب لای داوە ، لێرە خەریکی گێرەشێوێنیە . پاشان من داوای یارمەتی مانەوەم لە عێراق لە ئێوە دەکەم .
دوکتۆر مراد گوتی : " تۆ دژی پارتی ، ئێمە دەتوانین لە بیست وچوار ساعەت دا لە عێراق وەدەرت بنێین " .
لە گەڵ قسەی مراد ئیتر من ئاگرم گرت . گوتم " من باش دەزانم کاری پۆلیسی و خەیانەتو لە دەس دێ . ناپیاو بن ئەگەر ئەوەی نەکەن . بێ منەت بن . لە زیندانی شا دا برزم پێم لەوە باشترە بە قسەی ئێوە لە

عێراق رام بکرن "٠
مام جەلال وەدەنگ هات و گوتی :
- میوانی ٠٠٠ ئەگەر میوان نەبای ئەو قسانەم لێ قەبوڵ نەدەکردی"٠
- میوان نیم،من لە کوردستانم ، هەموو بەشەکانی کوردستانیش بە نیشتمانی خۆم دەزانم ٠ هەر ئەوەندەشت پێ دەکرێ بە پۆلیسی عێراق لە عێراق دەرم بکەی ٠ بێ منەت بن دەزانم کارتان هەر ئەوەیە ، هەر ئاواش کورد ئازاد دەکەن "٠
کابرایەکی زەلامە ئامێزێك شاڵی شینی لە پشتێ هالاندبوو ( پاشان زانیم سەید حەمەدەمینی عەبابیلە بوو) راست بۆوەو گوتی : " تەك خوا مبارەکی نەکا ، چۆن ئاوا کوردستانەکان بۆ ئازاد دەکەن ؟ کابرا لە بەر چنگی شا و ژاندارمەی ئێران هەڵاتووەو پەنای بۆ ئێرە هێناوە ٠ ئێستا ئێوە هەڕەشەی دەرکردنی لێ دەکەن ٠ ئەویش بە پۆلیسی عێراق ٠ ئەوەیە ئەم کوردایەتیەی ئێمە وەدوای کەوتوین ؟ ٠ ئەی بەزیادم نەکرد "٠
گوتم کاك سەید خۆت نارەحەت مەکە ٠ کوردایەتی هەر ئەوەیە ٠ ئیتر وەدەر کەوتم ٠ لە پێشدا چووم زۆر گەرام لە (شارع الکفاح ) نێزیك (قصرالبیض ) خانویەکم دۆزیەوە ٠ ئەرمەنی یەك ژورێکی هەبوو مانگێ بە شەش دینار لێم بە کرێ گرت ٠ هێندێ شت و مەکمان هەبوو گوێستەوە٠ چوکەلی گەوهەری جێگای نەبوو لە گەڵ من دەژیا ٠ یوسفی ئەنوەری و یوسفی رێزوانی و عەزیزی فەلاحی و حەمەی حاجی سەعیدی بەماڵەکەیان دەزانی٠
دوای رۆژێك چومە لای عەونی یوسف کە وەزیری پارتی بوو ٠ پاش چاوە ڕوانیەکی زۆر نورەم وەبەر کەوت چوومە ژورێ ٠ پێش ئەوەی من قسەی لە گەڵ بکەم مام جەلال هات ٠ کە چاوی بە من کەوت هەر بە سەر پێوە سەری بردە بن گوێ ی عەونی یوسف و سرتەیەکی لە گەڵ کردو رۆیشت ٠
پاشان من بە عەونیم گوت : " بە منیان راگەیاندوە لە عێراق بچمە دەر ئێستاش جەنابت وەك وەزیرێکی کورد بەڵکو کارێکی وابکەی دەرم نەکەن"٠

- بۆ ناچی له هەولێر وەك كادری پارتی ئیش بكەی • حكومەت لەوێ قـەت نات دوزێتەوە •
- نابم به كادری پارتی ، من كوردی ئێرانم كارم به شەڕە چەقەی پارتی و شیوعی نیه •
- كه وا بو تۆ شیوعی •
- شیوعی نیم ، بەڵام دوژمنایەتی شیوعی به قازانجی كورد نازانم• لــــه رێكخراوێك دا كار ناكەم كه له گەڵ شیوعیەكان كێشەی هەبێ •
- باوكم بەخوا من چم له دەس نایێ • ئەمە ئەوامیری حكومەتە •
- سپاس ••• زۆر باشه • وەدەر كەوتم •

وەزعی ژیانم زۆر خراپ بوو • پارەم نەبوو كەمالی كوڕم تا دەهـــات نەخۆشیەكەی توندتر دەبوو • زۆر جار له گەڵ دایكی دەمانگوت : ئەگــــەر بەرێ ئاسودە دەبین •

رۆژێكیان ناچار بووم چوومە لای وەستا برایمی وێنەگر بەڵكو پێنـــج دینارم به قەرز بداتێ • پێشتر هاتوو چۆی وەستا برایمی مان دەكرد •كاك حەسەنی قزلجی لای ئەو كابرایه كاری وێنەگری دەكرد• له حیاتی ئـــەوە كه یارمەتیم بدا و پارەم به قەرز بداتێ دەستی پێ كرد :
- باوكم ئێوە كەس نازانی چ دەكەن • له ئێران حیزبی توده هەیه • بۆ له گەڵ ئەو ئیش ناكەن ، ئەوەتا حەبیب ( پەروێزی حیكمەت جۆ ) لێرە نوێنـــەری حیزبی تودەیه • پارەت نیه بۆ ئیواران لەم پەنا شاریعه سێو جگـــــەر نافرۆشی • كاسبی عەیب نیه ••• بۆچی ئەمانی تر ئەوە له گەڵ حەبیــب ئیش دەكەن ••• بەخوا پارەم به دەستەوە نیه •

ئەم وەستا برایمه ئەندامی حیزبی كومونیست بوو • بەڵام وادیاربوو هـەر بەشی ئەوەندە له ماركسیزم تێ گەیشتبوو كه كورد نابێ بۆ خۆی بیـــــرو باوەڕی ماركسیستی هەبێ و پێشكەوتنخواز بێ ، حەتمەن دەبێ له ژێـــــر قامچی كۆمونیستێكی تورك و فارس و عەرەب بێ و بەوانەوە ببەسترێتەوە • كابرا ئەوەندە تێ نەگەیشتبوو كه ئەو دەمە پەروێزی حیكمەت جۆ هاتبـــــوە

بەغدا و دژی ڕێبەرایەتی حیزبی تودە دەجولایەوە • چەند کەسی لێ قەوماوی وەك عەولای عیزەت پور و یوسفی ریزوانی لە خۆ کۆکردبوویەوە و دەی ویست لە عێراقەوە بە هۆی ئەوانەوە لە ئێران حیزب ساز بکا • ئەوانیش لە بەر ناعیلاجی ڕەگەڵ ئەو کەوتبون • لە دنیادا کۆمونیستی نانی کەم نەبون (

## چەتەی ئەمین ڕەواندزی

کاتێك قاسملۆ لە بەغدا بوو لە گەڵ مالی ئەمین ڕەواندزی ڕەحمەتی ببووە ئاشنا و هاتووچۆیان هەبوو • منیش بەم بۆنەوە لام وایە یەك دوو جار چووبومە مالیان و چەتەی کوری ئەمین ڕەواندزیم دەناسی • کورێکی باش و تێ گەیشتوو بە مالەکەی منی دەزانی • ڕۆژێکیان بەیانی زوو بێ خەبەر وەژور کەوت • چایەکمان خواردەوە پاشان لە وەزعی ژیان و رابوردووی تێکۆشانی من پرسیاری کرد • پرسیارو قسەکانی وەك ئەوە دەچوون کە پێی ئەسپێردرابێ ئەم شتانە لە من بپرسێ • بە تەواوی ولامم داوەو ڕۆیشت لەو ماوەیەدا کە زانیم کۆمیسیونی پەنابەرانی سیاسی داواکەی منی ڕەتکردۆتەوە ، ئەو بەلێنی دابویان بە مەلا مستەفا هیچ نەتیجەی نەبوو ،چوومە وەزارەتی داخیلە لای کاك (هادی چاوەشلی) ئەو دەم یاری دەدەری وەزیری نێو خۆی عێراق بوو • زۆر پیاوانە بە خێرهاتنی کردم • نەی دەناسیم بانگی کرد چایان هێنا • پاشان وەزعی خۆم بۆ باس کردو گوتم : دەرکردنی من دەستی پارتی تێدایە • هەستم کرد زۆر تێك چوو بانگی سیکرتیرەکەی کردو گوتی : بلێ (دەوسیەی سالح توفیق لاجی سیاسی ئێرانی بێنن)• ئەوەندە پی نەچوو دەوسیەکەیان هێنا لە پێشیان دانا گوتی : کەس نەیەتە ژوور •

پاش ئەوەی لاپەرەکا غەزەکانی ئەودیو ئەو دیو کرد ، تاوێك راما و گوتی:

ـ کاکی خوم ••• لە بەینی خۆمان بێ و لە گەل کەس باسی مەکە • بریاری وەزیری داخیلەیە کە تۆ دەبێ لە عیراق دەر بکرێی • هیچ ریگای نیە•

تۆ خۆت فیکرێك بە حالی خۆت بکەوە ).
فرە سپاسم کردو وەدەر کەوتم .
چوومە لای کاك حەسەنی قزلجی و نامەیەکم بە عەرەبی بۆ کومیتەی ناوەندی حیزبی کۆمونیستی یەکێتی سوڤیتی نووسی . پاش ئەوەی کورتەی ژیان و بە سەرهاتی خۆم روون کردبۆوە ، داوام کردبو کە رێگا بدەن بچمە یەکێتی سوڤێتی و وەك پەنابەرێکی سیاسی لەوێ بژیم .
هەر لەو کاتەدا نامەیەکم ئەوتۆم بۆ بالویزخانەی بولغارستان و ئالمانی دیموکراتی و چیکوسلواکیاو رومانی و لهیستان و مەجارستان نووسی .
ئیتر لە مالێ وەدەر نەدەکەوتم نەم دەوێرا وەك جاران بچم بگەرێم.
وەزعی ژیانمان ئەوەندە خەراپ بوو ،هێندێك رۆژ تەنیا نانێکی وشکمان دەخوارد نەخۆشی کەمالی کوریشم ببوە داخ وسەرباری ژیانێکی تاڵ. ناچار چوومە لای کاك محەمەدی زێرینگەر و داوای دەدینار قەرزم لێ کرد. پیاوانە بە روویەکی خۆش دەدیناری دامێ.باشبوو ، بۆ چەند رۆژ توانیمان رۆژێ جەمێك شتێکی گەرم بخۆین. مالی مەسیحی دراوسێشمان لێمان خافڵ نە بوون .
لەم ناوەدا رۆژیەك بەیانی چەتەی ئەمین رەواندزی هاتە مالەکەمان چایەکی خواردەوەو پاشان بیست و چواردیناری هێنا دەری و گوتی بۆ تۆیان ناردوە . پاشان گوتی کاك نافیع یونس لە چاپخانە دەبێ،، ئەگەر کارێکت هەبوو دەتوانی بچیە لای ئەو .
لەو نامانەدا کە بۆ بالوێزخانەی ولاتانی سوسیالیستیم نووسیبوو ، ئادرێسی حوم دوکانی ( محەممەدی زێرینگەر خەلکی مەهاباد ) دیاری کردبوو کاك محەمەد تەلیفۆنی هەبوو ، مالە ئەرمەنیەکەی جیرانیشم تەلیفۆنیان هەبوو ، دەیتوانی ئەگەر کارێك هاتە پێش خەبەرم بداتێ .
پاش نووسینی ئەو نامانە رۆژێك چوومە لای ( محەممەد مهدی جواهیری شاعیری گەورەی عەرەب ) ئەو دەم رۆژنامەیەکی دەردەکرد بە ناوی (الرای العام ). وەزعی خۆم بۆ باس کرد . گوتم : کوردێکی ئێرانیم پاش چەند ساڵ حەبس و تێکۆشانی سیاسی مەجبور بوم لە ئێران رابکەم و پەنام

بو کۆماری عێراق هێناوەو ئێستا دەرم دەکەن • محەمەد مهدی جواهیری لە ڕۆژی دوایی دا سەرمەقالەیەکی زۆر توندی لە ڕۆژنامەدا نووسیبوو • هێرشی بردبوە سەر دەزگا دەوڵەتیەکان و نووسیبوی : ئەم هەنگاوەی ئەمن و وەزارەتی داخیلە بۆ کۆماری عێراق ڕسوایی و ئابرو چوونە •

پاش ئەوە ئیتر ڕۆژانە لە ماڵێدا دادەنیشتم و چاوەڕوانی چارەنووس بووم •

حەمەی حاجی سەعید هەر وەك باسمان کرد ، کاتێك هاتبوە بەغدا داوای پەنا بەری سیاسی کردبوو • پاشان کە ئێمە هاتینە عێراق هاتەوە نێو ئێمەو لە حاست بیرو باوەری سیاسی‌یەوە پێشکەوتنخوازو ئەوەندەی تێگەیشتبا مارکسی بیری دەکردەوە • لە ئێرانیش خەباتی کردبوو • لە سەر ناکۆکی بیرو باوەر ئەحمەد توفیق لەوێشی هەلێچابوو • ناچار لە هوتێلێك دەژیا • ڕۆژێك گرتبویان و بردبویانە مەرکەزی پۆلیس کە وەوانەی ئێرانی بکەنەوە • یا بە زاراوەی عێراقیەکان ( تەسفیری ) دەکەن • لە ماڵێ دانیشتبوم جیرانەکەمان بانگی کردم گوتی تەلیفون بانگت دەکا • دڵم خۆش بوو لام وابوو لە باڵوێزخانەی وڵاتانی سوسیالیەتی و لامێکم بۆ هاتۆتەوە • کە چومە سەر تەلیفۆن حەمەی حاجی سەعید بوو • گوتی : " ئەوە لە مەرکەزی پۆلیسەوە تەلیفۆن دەکەم گرتویانم و بە ناوی ئێرانی دەیانەوێ لە قەسری شیرین تەحویلی ئێرانم بدەنەوە •

لە کاتێك دا من بۆ خۆم لە ترسی پۆلیس وەدەر نەدەکەوتم هەستام و چوومە مەرکەزی شورتە کە بێگانەیان تەسفیر دەکرد • لەوێ نەیان دەناسیم چوومە ژورو لای مودیری پۆلیس سڵاوم کردو گوتم لە بەر " جەمال توفیق" هاتوم • لێرە داوای پەنابەری کردوە ، بڕیاروایە لە ئاخری مانگ کۆمیسیونی ئەمن و وەزارەتی داخیلە لە ئیشەکەی بکۆڵنەوە • ئێستا ئێوە گرتوتانە و دەتانەوێ تەسفیری بکەن • کابرا بێ ئەوەی لە من بپرسێ تۆ خۆت چکارەی گوتی دەبێ کەفیل بدا • گوتم من بۆی دەبمە کەفیل • بانگی پولیسێکی کرد گوتی کەفالەت لەو ئاغایە وەرگرەو جەمال توفیقی بدە دەستی •

کابرای پۆلیس شتێکی نوسی و من ئیمزام کرد • حەمەیان لە زیندان هێنا دەرێ و گوتیان برۆ • حەمە گوتی : نیو سەعاتی دیکە نەهاتبای رۆیشتبووم•

حەمەی حاجی سەعیدم نەجات دا ، بەلام چارە نووسی خۆم تاریک بوو نەم دەزانی چم بە سەر دێ • رۆژێك تەلیفۆنیان بۆ کردم کە بچمە چاپخانەی حیزبی کۆمونیست و کاك نافع یونس ببینم ئەوە هەوەڵ پێوەندی من بو لەگەل حیزبی شیوعی عێراق • کاتێك چووم نیژاد لەوێ بوو • گوتی بچۆ بالوێزخانەی ئالمانی دیموکراتی لەوێ داوایان کردوی • کاتێك چوومە بالوێزخانە ، یەکی ئالمانی کە عەرەبی دەزانی گوتی: " تو نامەیەکت نووسیبوو ولامی هاتۆتەوە ، لە ئالمانی دیموکراتی قبولکراوی دەتوانی بچیە برلین " •

- من پاسپۆرت و پارەی بلیتی تەیارەم نیە • چۆن بچم ؟

- بچۆ لیسێ پاسێ وەرگرە و بێنە ئێمە ویزات دەدەینێ •

گەرامەوە چوومە ئیدارەی ئەمنی عیراق • بردیانمە لای عەبدوالمجید مودیری ئەمن • کە چاوی بە من کەوت گوتی : تۆ لە کوێی ئەوە ماوەیەکە لێت دەگەڕێین • چەند جار لە مالە مەلامستەفامان پرسیوە • دەلێن بەجێگای نازانین •

- خانوەکەم لە شاریع النضال نێزیك ئیدارەی ئێوەیە •

- تۆ پێویستە لە عێراق بچیە دەر • ناتوانی لێرە بژی •

- پارەم نیە ، پاسپۆرتم نیە ئێوە سواری فرۆکەم کەن بۆ کوێ دەخوازن بمنێرن

- تۆ لە ئێرانەوە هاتوی، ئێمە دەتنێرینەوە بۆ ئێران،ئەگەر بۆ خۆت بڕۆی لیسێ پاسیت دەدەینێ کوێ دەخوازی بڕۆ•

- سێ مانگ مۆلەتم بدەن جێگایەك دەبینمەوە ، پارەیەك پەیدا دەکەم و دەڕۆم•

- سێ روژ مۆلەتت دەدەین ئەشێ پاش سێ روژ لە عیراق وەدەر کەوی •

پاش چەقەیەکی زۆر لە سەر پاڵدەرۆژ رێك کەوتین کە لە عێراق بچمە دەر • گوتی : دەبێ کەفیل بدەی •

- من بێگانەم کەس ناناسم ، لە بەغدا کەفیلم نیە •

ـ نابیّ ، ئەشیّ کەفیلی پێنج هەزار دینار بدەی کە لە عێراق بچیە دەر ۰
ناچار بوم تەلیفۆنم کرد بۆ کاك خسرو توفیق و پێم گوت. ئێستا لە ئیدارەی ئەمن راگیراوم ، کەفیلی پێنج هەزار دیناریان دەویّ ۰
هەرگیز لە بیرم ناچیّ ، ئەوەندەی پیّ نەچوو زۆر پیاوانە کاك خسرەو گەیشتە ئیدارەی ئەمن و کەفالەتی پێنج هەزار دیناری نووسی۰
بە مودیری ئەمنم گوت : ئێستا لیسیّ پاسیم بدەنیّ تا بتوانم لە ولاتێك ویزا وەربگرم ۰ نامەیەکی نووسی بۆ ئیدارەی سەفەرو جنسیە ۰ کە چوومە ئەو ئیدارەیە داوای وێنەیان لیّ کردم ۰ هاتمە دەر لە گەلّ خیزانم و منداڵەکەمان چووینە دوکانی کاك هەژاری شاعیر کە لە شاریع الکفاح دوکانی وێنەگەری هەبوو۰
کە چووینە ژور، کاك هەژار گوتی : (کورە ئەوە لە چی دەگەرێی ؟ هەر ئێستا ئەحمەد توفیق و ساڵحی خوارزای مەلامستەفاو پۆلیسێك بە دوای تۆ دا دەگەران ۰ دەیانگوت لە ئیدارەی ئەمن ویستویانەو خۆی شاردۆتەوە)۰
گوتم تازە هیچیان پیّ ناکریّ ۰ هاتوم وێنەمان بگری لە سەفەرو جنسیە لیسی پاسیمان دەدەنیّ و دەچینە ئالمانی دیموکراتی ، وەك پەنابەری سیاسی قبوڵ کراوین ۰ کاك هەژار زۆری پیّ خۆش بوو ۰ برادەرێکی کۆیی بە ناوی غەفور لە گەلّ کاك هەژار کاری دەکرد ۰ ئەندامی پارتی بوو کە بۆم گێراوە برێکی جنێو بە رێبەرەکانی پارتی داو هێندێك قسەی دیکە، گوتم کاك غەفور نارەحەت مەبە ، کوردایەتی ئاوایە ۰
لێرەدا ناکریّ قسەیەکی خۆشی ئەم غەفورە نەگێڕمەوە:
" رۆژێك لە دوکانی کاك هەژار بوم برای غەفور بە نێوی جەلال بێتوشی هاتە ژور، بە غەفوری گوت دەچمەوە شیمال هیچ کارت نیە ؟ غەفور گوتی کورە شیری مریشکەکانی کۆیە چاوت کوّرە کا لۆ ئەریّ،شیمال لۆ نارێی کوردستان ۰ دیاربوو جەلال شیوعی بوو، واتێگەیشتبوو ئەگەر بڵیّ کوردستان زمانی لاڵ دەبیّ ۰
بە کورتی کاك هەژار وێنەی گرتین و ئێستا ئەم وێنانە لەو لاپەرەیەدان ۰





النأشيرات — VISAs









وێنەی سەر جەوازی دەرکەوتن لە عیراق
ئەپریلی ـ ١٩٦٠ ـ



کۆی سنجاق  لە گەڵ دوکتور خالید سەعید
رەشەمەی ١٩٥٩



سلیمانی سالی ١٩٥٨ لە گەڵ برادەران

رۆژی ١٦/ ٤ / ١٩٦٠ لە ئیدارەی سەفەرو حنسیە لیسێ پاسـي
عێراقیان دامێ کە سەفەر بکەم . چوومە باڵوێزخانەی ئاڵمانی دیموکراتی
وێزایان دامێ و بە کونسولم گوت :
ـ من پارەم نیە ئەگەر ئێوە بلیتم بۆ نەکڕن ناتوانم سەفەر بکەم .
ـ من ناتوانم ئەم کارە بکەم ، بە من گوتراوە تەنیا ویزات بدەمێ . بۆ بلیت
دەبێ لە برلین بپرسم . چەند رۆژی تر سەربدەوە . وەدەرکەوتم و چوومەوە ماڵ
تا چەند رۆژی تر .

## قسەیەکی جەرگ بڕ

ئەو ماوەیەی لە بەغدا بوّین ، بێجگە لەوەی کە لە باری بەرێ چوونەوە شپرزە بووین ، کەسیشمان نەدەناسی ، کەس نەبوو هاتوو چۆی بکەین • تەنیا یەك دوو جار دەچوینە مالّی کاك هەژارو مالّە ئەمین رەواندزی لام وایە دوو جار بانگیان کردین • ئەوەش بۆ خۆی ببوە سەربا ریّکی ژیان •

کاتێك ویزای ئالّمانی دیموکراتیم وەر گرت چوومەوە مالّێ • بە خێزانم گوت ویزایان داومیّ و ئیشەکەمان تەواو بوە • خێزانم لای وا بوو تەنیا من دەڕۆم و بەجێی دێلم • بە چاوێکی ناهومێدی و پڕ لە ئاوات و هیوا وەك کەسێکی لیّ قەوماو دەستی لە عەرزو ئاسمانان بڕابێ چاوی پڕ بوون لە ئاو و گوتی :

ـ ئەدی من چە لیّ دەکەی ؟ بە جێم دێلّی ؟

بە بیستنی ئەو قسە کزەم لە جەرگی هاتوو لە لایەك هەستم کرد بە ئەوین و حەزو خۆشەویستی خێزانم ، لە لایەکی دیکەش ترس و ناهومێدی و لیّ قەوماوی کە دایگرتبوم • غارم دایەو لە ئامێزم گرت ، بە کولّی گریانەوە گوتم :

ـ چۆن بەجێت دێلم ؟ لە کن کیّ بە جێت دێلم ؟ قەت لە تۆ جیا نابمەوە ، پێکەوەین ، ها وەرە تەماشا کە لیسیّ پاسێکەمان رەسمی تۆ و کەمالیشی پێوەیە • خێزانم هاتەوە سەر خۆ بەلّام لە هەموو ژیانم داهەر کاتێك ئەو دیمەنەم وەبیر هاتبێتەوە کزەم لە جەرگی هاتوە •

پاش ئەوە کە لە باڵوێزخانەی ئاڵمانی دیموکراتی ویزایان دامێ
گەڕامەوە بۆ لای کاک نافیع یوتس پێم گوت : ویزایان داومێ بەڵام بلیتی فڕۆکەمان نیەو ناتوانین سەفەر بکەین ·

کاک نافیع گوتی : " دەکرێ بە سەییارە بچنە لوبنان و لە بێروتەوە بە پاپۆڕ بچنە ئاڵمان · دیارە ڕێگایەکی دوورە ، بەڵام چاریش نیە ·

گەڕامەوە ماڵێ و چاوەڕوانی بڕیاری باڵوێزخانەی ئاڵمانی دیموکراتی بووم کە کەنگی لێم دەگێڕنەوەو بلیتم بۆ دەکڕن ·

ڕۆژی دوایی بەیانی لە سەر نان و چا بوین دیتم چەتە وەزوور کەوت · حەفتا دیناری بۆ هینابوم ، گوتی ئەوە حیزب بۆی ناردووی کە تا لوبنان بە سەییارەو لەوێشەوە بە پاپۆڕ سەفەر بکەی ·

پارەمەتێکی زۆر گەورە بوو · سێ مانگ بوو کرێ خانووم نەدابوو ، لە سەر سەفەر بووم و هیچیشم شك نەدەبرد · لەو کاتەدا حەفتا دینار پارەیەکی زۆر بوو · بەتایبەت لە باری مەعنەوی یەوە پارمەتی حیزبی کۆموونیست بە کوردێکی دەربەدەری غەیرە کۆموونیست · ئەوە تەنیا هەڵوێستی ئینترناسیو-نالیستی و دڵسۆزی حیزبی کوموونیستی عێراقی نیشان دەدا ·

پشوێەکمان هاتبۆوە بەرێ · چاوەڕوانی بڕیاری باڵوێزخانەی ئاڵمانی دیموکراتی بووم · ڕۆژێك لە دووکانی کاک محەمەدی زێڕینگەرەوە تەلیفۆ-نیان بۆ کردم کە بچم بۆ باڵوێزخانەی چکوسلواکیا · کاتێك چووم گوتیان بلیتی فڕۆکەت بۆ هاتوەو لە دەفتەری فڕۆکەوانی هوڵەندا ئامادەیە ·

پاسپۆرتەکەت بێنە ، ویزات دەدەمینێ دەتوانی بۆ پراگ سەفەر بکەی ·

مزگێنیەکی خۆش بوو · گەڕامەوە بە برادەرانی حیزبی کۆموونیستم ڕاگەیاند کە لە چکوسلوواکیەوە بلیتی تەیارەم بۆ هاتوە · دە دینار بە کاک محەمەدی زێڕینگەر قەرزدار بووم ، چووم قەرزەکەم داوە · ڕۆژێ ٢٨ی ئەوریلی ١٩٦٠ چوو-مە باڵوێزخانەی چکوسلواکی ویزام وەرگرتوو لە شیرکەتی ( K.L.M ) بۆ ڕۆژی سی مانگ جێگام گرت · چۆمەوە ماڵ و بە خاوەن ماڵەکەم گوت : ئێمە دوو ڕۆژی تر سەفەر دەکەین ، ئەوە کرێ خانووی سێ مانگم بۆ هێناوی زۆر

سپاست دەکەم و ماڵئاوایی دەخوازم ٠
خاوەن ماڵی مەسیحی لە وڵام دا گوتی : من وەزعی تۆ دەزانم کرێ خانووم ناوێ ، بەو کەماڵە چکۆلەی دەبەخشم ٠ هیوا دارم سەفەرت خێر بێ ٠
شت و مەکی ماڵێ هەرچی هەمان بوو بۆ چوکەلی گەوهەری و یوسفی ئەنوەری ـ م بەجێ هێشت ٠ گوتم پێکەوە بژین و منیش هەوڵ دەدەم بەڵکو لە ڕێگایەکەوە یارمەتیکتان پێ بکرێ ٠ چووم ماڵئاوایم لە کاک حەسەنی قزلجی خواست و چاوەڕوانی ڕۆژی سی مانگ بوّم ٠
ڕۆژی ١٩٦٠/٤/٣٠ لە گەڵ خێزانم و منداڵێکی نەخۆشی بچکۆلانە لە فڕۆکەخانەی بەغدا سواری فڕۆکە بوین و لە چنگ ڕاو ناتی براکوردەکان رزگار بوین ٠
فڕۆکە شەو لە ژنێو مایەوە ٠ لە سەر حیسابی شیرکەت بردیانینە هوتێلێك ٠ منداڵەکەمان برسی بوو دەگریا ٠ ئێمەش زمانمان نەدەزانی نەمان توانی داوای خواردن بکەین ٠ ناچار لە ژنیوەوە تەلیفونم کرد بۆ پراگ ٠ لە گەڵ کاك ڕەحمانی قاسملۆ قسەم کردو گوتم گەیشتوینە ژنیو ٠ بەڵام کەمال برسیەتی و ناشتوانین حاڵیان بکەین کە نانمان بدەنێ ٠ وشەیەکی فەرانسی پێ گوتم کە ئێستا لە بیرم نەماوە چ بوو ٠ چوّم بە گارسونم گوت ، نانیان بۆ کەمال هێنا ، پاشان خۆشمان چوینە رەستۆران و نانمان خوارد ٠
بۆ بەیانی ڕۆژی هەوەلی مانگی مای ( جیژنی کریکارانی جیهان ) بوو لە چیکوسلواکیا کار ڕاوەستا بوو ، فڕۆکەخانەش کاری نەدەکرد ٠ ناچار فڕۆکە لە ژنیو هاتوو لە زوریخ مایەوە ٠ تا لای ئێواری لەوێ بووین ٠ لە ئێوارەدا سوار بووین و لە فڕۆکەخانەی پراگ دا بەزین ٠
کاك ڕەحمانی قاسملۆ لەگەل دوو کەس لە بەر پرسانی خاچی سووری چکوسلواکیا هاتبونە فڕۆکە خانە ٠ پاش بەخێرهێنان سواری ماشینیان کردین و بۆ نێو شار ٠ بردیانین بۆ " هوتیل ئەمبەسادۆر " لە " ڤاسلاڤسکی ـ نامیستێ " ٠ پێیان گوتین ئێوە لێرە میوانی حیزبی کۆموونیستی چکوسلواکی ـ ن لەم هوتێلە هەرچی دەخۆن و دەخۆنەوە لە سەر حیسابی ئێمەیەو تەنیا ئیمزای دەکەن ٠

## چکوسلواکیا و ژیانێکی تـــازه

چۆن گەیشتمە چکۆسلواکیا ؟

لە لاپەڕەکانی پێشوو دا باسم کردوه کە نامەیەکم بۆ هەموو وڵاتانـــــــی سوسیالیستی ناردو داوام کرد کە بە پەنا بەری سیاسی وەرم بگرن ٠ چـاوە- ڕوانی وەڵام بووم کە باڵوێزخانەی ئاڵمانی دیموکراتی بانگی کردم و گوتی دەتوانی بچیە برلین بەڵام لەبەر بێ بلیتی تەیارە مابوومەوە، پاش چەند ڕۆژ لە چکۆسلواکیاوە ویزاو بلیتی فڕۆکەم بۆ هات ٠ کاتێک گەیشتمە پـراگ کاک رەحمان گوتی : بەختەکەت بە کار بوو ٠ من چەند جار لەگەڵ دوکتـــۆر رادمەنیش قسەم کرد ٠ ناچارم کردن نامە بۆ حیزبی کۆمونیستی چکوسلوا- کی بنووسن کە ویزات بۆ بنێرن ٠ نامەکەیان نووسیبوو ، بەڵام مەسەلـــەی بلیتی تەیارە دژوار بوو ٠ بە خۆشی یەوە لە پڕ " رەحیمی ناموەر " پەیـــدا بوو کە دەگەڕاوە بۆ بەغدا ٠ واتا حیزبی تودە دەی‌نارده عێراق ٠

گوتی : ٥٠٠ دۆلارم پێیە بلیتی تەیارەشم هەیە ٠ دەس بەجێ بە تەلیفۆن بە دوکتۆر رادمەنیش ـ م گوت : بە رەحیمی ناموەر بڵێ بەو پارەی کە پێیەتی بلێت بۆ کەریمی حیسامی بکڕین و بێتە ئێرە ٠ پاش باسێکی زۆر رازیـــــم کرد و بە تەلیفۆن بە رەحیمی ناموەری گوت : کە ٥٠٠ دۆلارەکە بدا بە مـــن٠ وەرم گرت و چووم بلیتم کڕیو ناردم بۆ بەغدا ٠

دیارە زۆر سپاسی کاک رەحمانم کردو هەر وەها سپاسی حیزبی تودەش کـە یارمەتیان دابووم ٠

ئەو دەم کاک رەحمانی قاسملۆ وەک ئەندامی حیزبی تودە گەڕابۆوە بـــۆ

چکوسلواکی و له پراگ له " هوتێل ئۆروپا " دەژیا •

ڕۆژی دوایي که گەیشتینه پراگ به کاك ڕەحمان ـ م گوت منداڵەکەمان زۆر نەخۆشەو پێویسته بچێته لای دوکتۆر •

کاك ڕەحمان به خاچی سووری ڕاگەیاندو بەیانی ماشینێك هاتوو لەگەڵ خوشکه نەسرین خێزانی کاك ڕەحمان کەماڵمان برد بۆ خەستەخانه • دوکتۆر هاتوو منداڵەکەی له ئێمه وەرگرت و بردی • ئێمه له زۆرێك چاوەڕوان بووین ، پاش دوو سەعات دوکتۆرێکی ژن هات • بەخێرهاتنی کردین و گوتی :

ـ لێره خۆتان به غەریب مەزانن ، وەك نیشتمانی خۆتانه ، هیوادارم بەخۆشی ڕابوێرن• بەلام بەداخەوه ناچارم خەبەرێکی ناخۆشتان بدەمێ • کوڕەکەتان زۆر نەخۆشه ، لەوانەیه دوو ساڵ له خەستەخانه بێ • ئێوه دەتوانن ڕۆژەکانی هەوتوو بێن له بەر پەنجەرەوه چاوتان پێ بکەوێ • چونکه لێره هاتنه زۆر بۆ نەخۆشخانەی مندالان قەدەغەیه •

خێزانی کاك ڕەحمانی قسەکانی دوکتۆری بۆ گێڕاینەوه • دایکی کەمال دەستی کرد به گریان و گوتی : " له ئێران دەیان گوت له ولاتانی سوسیالیستی دەوڵەت مندالان له دایك و بابی دەستێنێ و کەس منداڵی له لای خۆی نیه • دیاره ڕاست بوو ، ئەوەتا منداڵەکەیان لێ هەستاندین" •

دلخۆشیم داوەو گوتم وا نیه ، دەبێ زۆریش سپاسیان بکەین که کوڕەکەمان بۆ چاك دەکەنەوه •

گەڕاینەوه بۆ هوتێل ، بەلام فیکری کەمال هەر له سەرمان دابوو• هوتێلێکی یەکجار زۆر خۆش و هەموو شتێك مشه بوو • ئێمه زمانمان نەدەزانی ناوی چێشت و خواردەمەنی چکی مان نەدەزانی • به ئینگلیزی جارێك به گارسونمان گوتبوو " چیکن " • ئیتر هەموو جەمێك گارسون بێ ئەوەی پرسمان پێ بکا مریشکی بۆ دێنایین • ئەوەندەمان مریشك خواردبوو کەم مابوو هێلکه بکەین !

جارو بار دەچووینه لای کاك ڕەحمان و خوشکه نەسرین • ناوی چەند خواردنیان بۆ نووسیبووین و کەم کەم فێر دەبووین •

مانگێك بوو گەیشتبووینە پراگ ، خێزانم چوە نەخۆشخانەو رۆژی ۱۹٦۰/٦/۳ کچێکی بوو ناومان نا شلێر . لەبەر ئەوە کە خانومان نەبوو ، منداڵی بچوکیش نەدەکرا لە هوتێل بێ ، پاش چەند رۆژ کە دەبوایە خێزانم لە نەخۆشخانە بێتە دەر ، بردیان بۆ " کرچ " .

کرچ شوێنێکی دەورو بەری پراگ بوو کە دایك و منداڵی بێ جێیان لـێ رادەگرت . باخێکی گەورە بیناو خانووی زۆر جوان و خۆش ، ئاسایشگایەکی فرە خۆش و سازگار بوو. دوکتۆرو مامان و سیسترای زۆری لێ بوون . چوونی " کرچ " خێزانمی مەجبوور دەکرد فێری زمان بێ . دوکتۆر مامۆستایەکی بۆ دیاری کردبوو دەرسی پێ بڵێ و فێری نووسین و خوێندنەوەی بکا . هەر ئـەوە وای کردبوو کە لە پێش مندا فێری چکی ببێ .

من بە تەنیا لە هوتێل مابوومەوە . لەو رۆژەوە کە منداڵەکەمان بردبـوە نەخۆشخانە ، راست ۳٦ رۆژ تێ پەڕیبو ، لە نەخۆشخانەوە تەلیفۆنیان کردبوو بۆ خێزانی کاك رەحمان کە بچین کەماڵ وەرگرینەوە .

لەگەڵ خوشکە نەسرین چووینە نەخۆشخانە . کەمال لەگەڵ مندا ڵان گەمەی دەکرد ، من نەمناسی یەوە . خێزانی کاك رەحمان لە دوورەوە کەمالی نـاسـیو رای کرد لە ئامێزی گرت ، کەمال قەڵەو ببوو وەك تۆپ دەجووڵاوە . جلـی خاوێنیان کردە بەرو دوکتۆر هات . هەر ئەو دوکتورە بوو کە رۆژی هەوەل پـێی گوتبوین کە دەبێ دوو ساڵ لە نەخۆشخانە بێ .

لە پێشدا بەخێرهاتنی کردین و گوتی : " ببورن ئێمە لە هەوڵەوە باش لە نەساخیەکەی نەگەیشتبوین . پاشان بۆمان دەرکەوت کە نەخۆشیەکەی تەنیـا برسیەتی بوە . خواردنی تەواوی نەبوە ، ریخۆڵەی وێك هاتوون ئێمە لێـرە تەنیا پیشکوت و شیرمان داوەتی ، ئێستا ئەوە دەی بینن کوڕێکی جـوان و قەڵەو و بزۆزە ".

کەمالمان وەر گرت و بۆ هوتێل گەڕاینەوە پاش چەند رۆژ کەمالم بـردە یانەی مناڵان و رۆژەکانی شەموو یەك شەموو دەم هێناوە لای خۆم و دەچووین لە کرچ سەری دایکی کەمالمان دەدا .

## پێوەندی لەگەڵ حیزبی تودە لە ئۆروپا

من لە ئێران ئەندامی حیزبی تودە نەبووم ، بەڵام هاوکاری نێزیکی حیزبی دیموکرات و حیزبی تودە جۆرێك بوو کە ئەندامانی حیزبی تودە لە کوردستان لە تێکۆشان و شانەو کۆبوونەوەکانی حیزبی دیموکرات دا بەشدار دەبوون ، حیزبی تودە لە کوردستان رێکخراوی تایبەتی خۆی نەبوو ، رێکخراوی حیزبی دیموکراتی لە کوردستان بەرێکخراوی خۆی دەزانی ، ئەندامانی حیزبی دیموکراتیش لە تاران و لە شارەکانی تری ئێران وەك ئەندامی حیزبی تودە لە تێکۆشان و شانەو کۆبونەوەکانی حیزبی تودە دا بەشدار دەبون ، هەر وەك لە پێشوو دا باسکرا کاك رەحمانی قاسملۆ وەك کادرێکی حیزبی تودە ناردبوویانە کوردستان کە لە باری رێکخستن و پەروەردە کردن و رێنوێنی یارمەتی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان بکا ، ئەو دەم حیزبی دیموکرات پەیرەو پرۆگرامێکی نەبوو ، لە ژێر درۆشم و سیاسەتی حیزبی تودە دا کار دەکرا و لە راستیدا سیاسەتی حیزبی تودە لە کوردستان بەرێوە دەچوو ،

پاش کودێتای ۲۸ی گەلاویژی ۱۹۵۳ زۆربەی کادرو ئەندامانی بەرێوەبەرایەتی حیزبی دیموکرات گیران و یان رایان کردو دەربەدەر بون ، کاك رەحمانی قاسملۆ کە وەك ئەندامێکی حیزبی تودە هاتبوە کوردستان و چاوی بە وەزعی کوردستان کەوتبوو ، لە پرستیژو نفوزی حیزبی دیموکرات ئاگادار ببوو ، لە نێو کادرەکانی حیزبی دیموکراتیشدا کەسی لە خۆی خوێندەوارترو زیرەك تر نەدیبۆوە ، لە لایەك پێوەندی ئەندامەتی لەگەڵ حیزبی تودە

پاراستیبوو ٠ لەو کاتەدا لە تاران دەگیرێ ، پاش چەند رۆژ راگرتن دێتـــە دەرێ و لە گەڵ چەند کەس لە ئەندامانی حیزبی دیموکرات کۆمیتەی سەرکر- دایەتی پێك دێنێ و بە روالەت پێوەندی لەگەڵ حیزبی تودە دەپچرێنی ٠پاشان سەید عەولای ئیسحاقی ساز دەکا کە بچنە ئۆروپا لە بارەی یەکێتی و ریـــك کەوتن لە گەڵ حیزبی تودە وتو وێژ بکەن ٠ لە ئۆروپا لە گەڵ سەید عـــەولای- ئیسحاقی تێك دەچن و دووبەرەکیان لێ پەیدا دەبێ ٠ ئیسحاقی دەگەرێتەوە بۆ کوردستان و کاك رەحمان لە پراگ دەمێنێتەوە ٠

پاش شۆرشی ١٤ای تەموزی عیراق ( ١٩٥٨ ) ، کاتێك مەلا مستەفا دەگەرێتەوە بۆ عێراق لە پراگ لا دەدا ٠ کاك رەحمان دەچێتە لای مەلا مستەفاو پاشـــان بە تەکبیری دوکتۆر رادمنیش دێتەوە عێراق ٠

لەو ماوەیە دا کە کاك رەحمانی قاسملۆ لە پراگ دەبێ ، ئەویـــش وەك ئەندامانی دیکەی حیزبی تودە دەکەوێتە نێو گێژاوی ناکۆکی و دووبەرەکـــی رێبەرانی حیزبی تودەو لایەنگری لە دوکتۆر رادمەنیش دەکا ٠

من کە گەیشتمە پراگ لە ناکۆکی و دەستەبەندی نێو حیزبی تودە بـــێ خەبەر بوم ٠ پاش چەند رۆژ ئەندامانی حیزبی تودە کە زانیبویان یەکێك لـــە وڵاتەوە هاتوە ، یەك یەك و دوو دوو دەهاتنە لام و هەر کەس بە شێوەیـــەك باسی رێبەرایەتی دەکرد٠

هەوەل کەسی ئێرانی تودەیی کە لە پراگ هاتە لام ، سەرگورد پـــولاد دژ ئەفسەری پێشوی ئەرتەشی ئێران و ئەندامی رێکخراوی ئەفسەرانی حیزبـــی تودە بوو ٠ رۆژێك لەگەڵ خێزانی هاتنە لام٠ زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیـــان کردم و هێندێك باسی وڵاتیان پرسی ٠ پاشان بێ ئەوەی من بناسن دەستیـــان کرد بە غەیبەت و هێرش بۆ سەر رێبەرایەتی حیزبی تودە ٠ لە باســـــــی دووبەرەکی و دەستەبەندی قسەی پرو پوچ هیچیان تێدا نەهیشتەوە٠ پاشـــان هاتنە سەر کاك رەحمان ، گوتیان بە پاسپۆرتی خێزانم لە ئێران هاتوتـــــە دەرێ و هاتوتە ئۆروپا لێرە پاسپۆرتەکەی نەداوینەوەو دەستی بەسەر داگرتوە

من گوتم : رێبەرانی حیزبی تودە ناناسم ٠ بەلام کاك رەحمان باش دەناسم،

له کوردستان بوه ، ئەندامێکی تێکۆشەرو کادرێکی بەرزی حیزبی تودەیە·
لەگەڵ دوکتۆر رادمنیش سکریتێری حیزب نێوانی خۆشە· کە باسی رادمنیش-م
کرد ئاگریان گرت و ئەوەندەی دیکەش بە دوکتۆر رادمنیش و کاك رەحمان دا
هاتنە خوار · هەستان گوتیان ئێمە لە " ژیتنا " دەژین · ئەگەر کارێکت هەبوو
بەچاوان وەرە لامان ·

رۆژی ۱۹٦۰/٥/۱۸ یەکێك بە ناوی " سهرابی " هاتە لام · خۆی ناساندو
گوتی : " من لێرە نوێنەری حیزبی تودە و بەر پرسی رێکخراوی ئێرەم" هەر
کارێکی هەت بێ تەلیفۆنم بۆ بکە چەند رۆژی دیکە کۆبوونەوەی حیزبیمان
دەبێ ، پێویستە تۆش بەژداری بکەی "·

ـ من ئەندامی حیزبی تودە نیم ، تەنیا حیزبی دیموکرات هاوکاری هەبوە لەگەل
حیزبی تودە چۆن دەتوانم لە کۆبوونەوەکانی حیزبی دا بەشدار بم ؟

ـ بۆ رۆی سیاسی نامەی بۆ من نووسیوە کە تۆ وەك ئەندامی حیزبی دەتوانی
لە کۆبونەوەکانی ئێمەدا بەشدار بی ·

ـ زۆرم پی خۆشەو بەشدار دەبیم ·

ئەویش بە خێرا خۆی هێندێك دژی کاك رەحمان قسەی کردو بە دوکتۆر رادمنش
دا هاتە خوارێ · بۆم دەرکەوت کە لایەنگری کیانوری یە ·

چەند رۆژێك پێ چوو لە هوتێلەکەی خۆم دانیشتبووم کاك رەحمان هات ·
گوتی : احسان طبری هاتوە لە هوتێلی حیزب میوانە · با بچین سەرێکی
بدەین · پێم خۆش بوو ناو بانگی طبری م بیستبوو ، نووسراوەکانم خویندبوو-
نەوە ، حەزم دەکرد چاویشم پێی بکەوێ · لە گەڵ کاك رەحمان چووینە هوتێلی
حیزب · زۆر بە گەرمی بە قسەی خۆش بەخێرهاتنی کردین · لە رادە بەدەر لە
منی پرسی ، لە منداڵەکانی پرسیم · لە بارەی وەزعی ئێران و کوردستان
پرسیاری کرد · پاشان گوتی تۆ لێرە لەگەڵ هاورێیانی ئێمە فەرقت نیە·
ئێمە لە ئێرانیش لەگەڵ حیزبی دیموکرات فەرقمان دانەناوە · خۆ هاورێ
رەحمان باش دەزانی ·

پاشان گوتی : ئێمە وا بە باش دەزانین کە تۆ مەدرەسەی بەرزی حیزب بخوێنی

هەر چۆنێك بێ کوردستان پێویستی بە کادری مارکسیستی هەیە، ئێستاش دەرفەتێکە لەوێ بخوێنی • پاش هێندێك قسەو باس هەستاین و لەگەڵ کاك رەحمان وەدەر کەوتین •
رۆژی دوایی "سهرابی " هات و گوتی : " فەرموو با بچین بۆ کۆبوونەوە •
ـ کۆبوونەوەی چی ؟
ـ کۆبوونەوەی سالانەی رێکخراوی چکوسلواکی یە • لە شارەکانی دیکەشەوە هاتون •
ـ رۆیشتین بۆ کۆبوونەوە ، نێزیکەی ٢٥ کەس ئەندامانی حیزب ئامادە بوون بەرنامەی کۆبوونەوە ئەوە بوو کە باسی تێکۆشانی سالانەی رێکخراو بکرێ و بەر پرسی رێکخراو هەڵبژێردرێن •
لەبەر ئەوە کە لە کۆبوونەوەی پێشوودا نەیانتوانی بوو بەرپرسێك هەڵبژێرن کەس نەبوو راپۆرتی سالانە پێشکێش بکا •
کاتێك احسان طبری گوتی با سهرابی وەك نوێنەری حیزب راپۆرتی کاری خۆی بدا ، بوو بە هەرا • دەیانگوت سهرابی نوێنەری بۆ رۆی سیاسی-یە ، ئێمە هەڵمان نەبژاردووە ، با راپۆرتی خۆی بدا بە بۆ رۆی سیاسی •
چەند کەس پرسیاریان لە احسان طبری کرد ئەوە کێ یە ، چۆن بەشداربوە، ئەندامی حیزبە یان نا ؟
طبری گوتی : ئەندامی حیزبەو تازە لە ئێرانەوە هاتوە •
روویان تی کردم کە باسی وەزعی ئێران بکەم• منیش ئەوەی دەمزانی لەگەڵ هێندێك رەخنە لە رێبەرایەتی حیزبی تودە باسم کرد پاشان گوتم : کاك رەحمانی قاسملۆ بۆ لە کۆبوونەوەدا نیە ؟
یەك دوو کەس هەڵیان دایە گۆتیان قاسملۆ ئەندامی حیزب نیە ، لە پارەکەوە رۆیشتوە لەگەڵ حیزبی کوردی عێراق هاوکاری دەکا • پولاد دژ توند هێرشی بردە سەر قاسملۆ یەك دوو کەسی دیکەش لێ یان وەردەگرتەوە •
گوتم ئەوە ئوسولی کاری حیزبی نیە • دەبوایە بانگ بکرێ ئەگەر کەسێك

ڕەخنەی هەبوو بەرەو ڕوو باسی بکا ٠
احسان طبری گوتی : (هاوڕێ قاسملۆ ئەندامی حیزبە دەبوایە بۆ کۆبوونەوە بانگ بکرێ ٠ ئێستا کە بانگ نەکراوە قەی ناکا)٠
من تازە کە لە ولات هاتبوومە دەر، جۆرێکی تر لە حیزبایەتی دەگەیشتم، لەو کۆبوونەوەیە سەرم سوڕ ما کە دیتم ئەندامانی حیزب کاریان بۆتە یەکتر پەلاماردان و تاوانبار کردن و بە با کردنی کای کۆن ٠
احسان طبری گوتی : "هاوڕێ حیسامی لەو وەزعە نارەحەت مەبە ، دووری لە نیشتمان ، دووری لە خەبات و تێکۆشان ئەو دم بەدەمەو شەڕە چەقەی لێ پەیدا دەبێ ٠
پاش ئەوەی لە تاوانبار کردنی یەکتر و ڕێبەرایەتی حیزب ماندوو بوون ، نەیانتوانی هیچ کەس وەک بەرپرسی ڕێکخراو هەڵبژێرن ٠ طبری گوتی ئەگەر وایە بۆ ڕۆی سیاسی بەر پرس و نوێنەری خۆی دیاری دەکا ٠
بە تەنیا لە هوتێل ئەمبەسادۆر مابوومەوە ٠ گەلێک ڕۆژان دەچووم لە کرج سەری خێزانم دەدا ٠ ڕۆژەکانی شەمۆ یەک شەمۆ کەمال دەهاتەوە لام و لە گەڵ ئەو خۆم دەخافلاند ٠
کاک ڕەحمان کەم کەم ئەلف و بێ چەکی بۆ نروسیبوومەوەو فێری زمانی چەکی دەکردم ، خۆشم خەریک دەبووم کە فێری زمان بم ٠ زۆر جاران لەگەڵ خۆی دەی بردم بۆ شوێنە مێژوییەکانی پراگ ، وەک موزەی شۆڕش " کلیمینت ـ گوت والد " ، موزەی میللی کۆشکی سەر کومار " هراد چانی " وە شوێنی دیکە ٠ نووسراوەکانی بۆ دەخوێندمەوە و لە ڕوون کردنەوەی هۆش و بیرم دا تەئسیری زۆری هەبوو ٠
لە پێوەندی لەگەڵ ئەم کارەی کاک ڕەحمان دا شتی سەیرم هاتە بەر چاو، ڕستمی یەکێک لە ئەندامانی حیزبی تودە کاتی خۆی لە مەهاباد ئەفسەری بچوک بوو ٠ پاش گرتنی ئەفسەرانی حیزبی تودە ڕای کردبوو هاتبوە چکوسلوا- کی و لە شاری برنۆ دەژیا ، ڕۆژێک هاتە سەردانم پاشان وەدەر کەوتین بسوڕێینەوە ، لیم پرسی قەت چوویە موزەی شۆڕش ؟

خەباتی حیزبی کۆموونیستی چکوسلواکی بە جوانی نیشان دەدا ٠
لە ولام دا گوتی : نا نەم دیوە٠٠٠ با بچین بزانین لە کوێ یە ؟
پێم سەیر بوو ئەو برادەرە چەند ساڵ بوو لە چکوسلواکی دەژیا جارێك نەچوو ـ بوو ئەو موزەیە ببینێ ٠ لە کاتێك دا من تازە چووبووم کاك رەحمان ئـــەو شوێنانەی نیشان دابووم ٠ چووینە موزە ٠ پەیکەری گوتوالد رێبەری حیزبـــی کۆموونیستی چکوسلواکی لە سالۆنی یەکەم دانرابوو ٠ پرسی :
ــ ئەوە کێ یە ؟
ــ وەك کاك رەحمان بۆی باس کردبووم گوتم : ئەوە کلیمینت گوتوالدە "رێبەری حیزبی کۆموونیستی چکوسلواکی و یەکێك لە پیاوە بەرزەکانی جولانـــەوەی کۆموونیستی جیهانە ، کرێکاری کانگای خەلوس بوە٠
بە گاڵتەو تواتجەوە گوتی :
ــ بگو رضا روستای ماست دیگە ٠ واتا ( بلێ رەزا روستای ئێمەیە )
رەزا روستا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی تودەو سکرتێری سەندیکـــای کرێکارانی ئێران و ئەندامی سکرتاریاتی فیدراسیۆنی کرێکاراتی جیهان بوو٠
لە پراگ هەوەڵ کارم ئەوە بوو کە مەسەلەی ژیانی چەند برادەرێك لە گـەل کاك رەحمان باس بکەم و بەلکی کارێکی بکەین یارمەتیەکیان پێ بکرێ٠
چونکە ئەحمەد توفیق تێی هەڵپێچابوون ، لە کۆمۆن دەری کردبوون وەزعـــی ژیانیان زۆر خراپ بوو٠ پێم گوت نامەیەك بۆ دوکتۆر رادمنیش بنووســـێ و داوای یارمەتی لێ بکا٠ گوتی : نامە نووسینی ناوێ ، من چلدینارم بـــۆ ناردوون گوتم ببیدەن بە عەزیزی فەلاحی ئەویش بیانداتێ ٠ کە وای گوت من گوتم عەزیز ئەو پارەیە بە ئارەق دەداو ناشیان داتێ ٠
بە دوای ئەوە دا نامەیەکم بۆ دوکتۆر رادمنیش نووسی داوام لێ کـــرد کە عەبدولای عێزەت پور و یوسفی رێزوانی و یوسفی ئەنوەری بێنـــە دەرێ بخوێنن٠ لە نامەکە دا نووسیم ئەو کارە یارمەتیەکی گەورە دەبێ بە حیزبـــی دیموگراتی کوردستان ٠
یەك یەك لە برادەرانی حیزبی تودە دەهاتنە لام کاریان ئەوە بوو رەخنە لـــە

ڕێبەرایەتی حیزبی تودەو حیزبی کۆمۆونیستی چکوسلواکی.گوتیان ڕۆژنامە ـ کانی ئێرە دژی شای ئێران هیچ نانووسن و تەنانەت تەعریفی شاش دەکەن ۰ من هیچم نەگوت چونکە لەو ڕۆژەوە کە گەیشتبوومە پراگ بێجگە لە ڕەخنەو غەیبەت هیچی دیکەم لەو برادەرانە نەبیستبوو۰ تازەش لە ئێرانەوە هاتبووم پێم وابوو کە وڵاتانی سۆسیالیستی حەقیان نیە قازانجی خۆیان لەبەر چاو بگرن یان دەبێ بە هەوای چەند کەسی ڕاکردوو سەما بکەن ۰

ڕۆژی ۲۵ی مارسی ۱۹٦۰ دوکتۆر رادمنیش وڵامی نامەکەی منی دابوو وەو نووسیبوی : لە بارەی ناردنی پول وە یارمەتی بە هاورێیانی کورد لە عێراق وەك بە ئێمەیان ڕاگەیاندوە ئەو دووسەد دۆلارەی کە بە هۆی هاورێ ئەنوەری (ڕەحمانی قاسملۆ) ناردوومە ، لە عێراق گەیوەتە دەس کەسێك کە ئارەق خۆرە و بەشی زۆری ئەو پولەی بۆ خۆی هەل گرتوە کەمێکی داوە بەوانی‌تر تکایە ئادرێسێکم بۆ بنێرە کە ئەم گیرو گرفتەی نەبێ ۰

لە نامەی دوکتۆر رادمنیش دەر دەکەوت کە کاك ڕەحمان پارەی لێ وەرگرتوە هێندێکی ناردوە بۆ بەغدا بەلام نەگەیوەتەدەس ئەو برادەرانەی کە دەبوایە وەری بگرن ۰ ڕۆژی ۱۹٦۰/٦/۱ یوسفی ئەنوەری لە بەغداوە نامەیەکی بۆ نووسیبوم کە وەزعی شپرزەی برادەرانی نیشان دەدا ۰ لە نامەگەدا نووسیبوی : " کاك عەولای عیزەت پور بۆی نووسیوم کە وەزعی یەکجار نارەحەتە جنێو پێ دان بە چاوی سووك تەماشا کردن پارە پێ نەدان ئاوایە وەزعی ئەو برادەرانە ۰ نووسیویەتی کە زۆر بە توندی نامە بۆ ئێوە بنووسم۰

هەر چەند لە بارەی هێنانی یوسفی ڕێزوانی و عەولای عێزەت پورو یوسفی ـ ئەنوەری بۆ ئۆروپا یەك دوو نامەی دیکەم بۆ ڕێبەرایەتی حیزبی تودە نووسی بەڵام گوێیان نەدامێ ۰ ئەو برادەرانە زۆریان ناچار بوون بچنەوە ئێران و خۆیان تەحویل دەنەوەو بکەونە زیندان ۰ عەولای عێزەت پور لەگەڵ پەروێزی حیکمتجو کەوت و ناردیەوە بۆ ئێران و گیرا ۰ هێندێکیش لە عێراق بڵاو بوون و زۆر بە شپرزەیی ژیانیان دەبردە سەر ۰ ئێمەش لەگەڵ کاك ڕەحمانی قاسملۆ لە پراگ خەریکی ژیانی خۆمان بوین و بە کردەوە لە گەڵ حیزبی تودە بووین ۰

## هەوای نوێنەرایەتی

رۆژێك لە پراگ كاك رەحمانی قاسملوّ ( ئەو دەم هێشتا دوكتۆرای وەرنەگرتبوو ، بۆیە وشەی دوكتۆر بە كار ناهێنم ) بانگی كردم گوتی :
ـ مەسەلەیەك هەیە پێم خۆشە پێكەوە قسەی لێ بكەین ٠
چوومە لای كاك رەحمان ، پاش دانیشتن و هێندێك ئاخافتن گوتی :
" رەحیمی قازی نامەی بۆ نوسیوم دەڵێ حیزبی تودەی ئێران و فیرقەی دیموكراتی ئازربایجان خەریكن رێك كەون و ببنە یەك حیزب ٠ دەیانەوێ لەگەڵ حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێرانیش وتو وێژ بكەن كە وابوو ئێمە لەگەڵیان بكەوینە وتو وێژو كێ هەیە لە من و تۆ موستەحەق تر كە بەناوی حیزبی دیموكرا-تی كوردستان قسە بكاو لە گەڵ حیزبی تودە یەكێتی پێك بێنێ " ٠
گوتم نەزەری تۆ چیە ؟
ـ قسەی كاك رەحیمی راستە حیزبی تودە لە گەڵ فیرقە رێك دەكەوێ و دەبن بە یەك ٠ روسەكان پێیان دەكەن ، كە وا بوو ئێمە بۆ چی نەیكەین ؟
ـ من لام وایە ئێمە هیچمان لێرە نوێنەری حیزبی دیموكرات نین ٠ بە تایبەت كاك رەحیمی قازی ئەوە ١٥ ساڵە لە وڵات دوورە ، چۆن دەتوانێ بە ناوی حیزبی دیموكرات قسە بكا ٠ من بە تەواوی موخالیفم ٠ یەك گرتن لە ئۆروپا تەنیا بۆ وەدەست هێنانی ناوی رێبەرایەتی و دابەش كردنی كورسی یە ٠
ـ ئێستا ئەوان لە باكۆ رۆژنامەی كوردستان بە ناوی ئۆرگانی حیزبی دیموكرا-تی كوردستان بڵاو دەكەنەوە ٠
ـ با كوردستان بڵاو بكەنەوە بەڵام نە ئەو رۆژنامەیە ئۆرگانی

حیزبی دیموکراتەو نە ئەوانیش ڕێبەری حیزبن ۰
قسەکانمان دوایی هات ، ئیتر نازانم چی وەلامی کاك رەحیمی قازی داوە۰
لەو سەرو بەندە دابوو دوکتۆر رادمنیش هاتە پراگ ۰ لە هوتێل بووم کاك رەحمان تەلیفۆنی بۆ کردم گوتی :
ــ دوکتۆر رادمنیش لێرەیە قەرارە سەعات چوار لە هوتێل ئۆروپا بێتە لای من تۆش وەرە لێرەدا دا دەنیشین ۰ ئەو دەم کاك رەحمان بە ژن و منداڵەوە لە هوتێل ئوروپا دەژیان ۰ پێش سەعات چوار چوومە هوتێل زۆر پێ نەچوو دوکتۆر رادمنیش هات ۰ هەوەل جار بوو سکرێتێری گشتی حیزبی تودەی ئێرانم دەبینی ۰ پیاوێکی بێ فیس لە سەر خۆ هەر لەو کاتەشدا مرۆڤێکی تێگەیشتوو بوو ۰
هێندێك باسی ئێرانمان کرد ، لە قسەکانی دەر دەکەوت کە جەرگی بۆ ئەم وەزعە دەسووتێ ۰ من مەسەلەی یارمەتی بە برادەرانی کە لە عێراق مابوونەوەو هێنانی چەند برادەر بۆ ئوروپا بۆ خویندن هینامە گۆرێ دوکتۆر رادمنیش لە وەلام دا گوتی :
ـ ئەو مەسەلە بۆ ئێمەش لە گۆرێ دایە ۰ ئێمە دەبێ لەگەڵ برادەرانی حیزبی دیموکرات بگەینە نەتیجەیەك واتە ئەم وتو وێژەی بۆ یەك گرتن لە پێشەوە دەس پێ کرابوو درێژە پێ بدەین ۰
کاك رەحمان لەو بارەوە هیچی نەگوت ۰ پاشان بە رادمنیشی گوت : "خێزانم نامەی بۆ ئێوە نووسیبوو داوای کردبوو کە بە ئەندامی حیزبی تودە وەری بگرن تا ئێستا وەلامی نەدراوەتەوە ۰ من داوا دەکەم کە خێزانم بە ئەندامی حیزبی تودەی ئێران قبوول بکەن ۰
دکتۆر رادمنیش گوتی :
ــ بەڵێ ۰۰ ئێمە نامەکەمان وەرگرتوە ، بەلام جوابی چی بدەینەوە ۰ خێزانت ئێرانی نیە ، چەکە خەڵکی چکوسلواکی یە ، چۆن دەتوانێ ببێتە ئەندامی حیزبی تودەی ئێران ؟
ـ ئێستا ئەو پاسپۆرتی عێراقی پێیە وەك بێگانەیەك لێرە دەرس دەخوێنێ ئێستا ئەو ئیتر بە چەك ناناسرێ ۰

دوکتۆر رادمنیش گوتی :

ـ ئیتر ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە ، کاری خۆتانە ، چۆن دەخوێنێ بـــــــە ج پاسپۆرتێکو بە چ ناوێك لێرەیە ئەوە خۆتان دەیزانن •

پاشان رووی لە من کرد گوتی :

ـ ئێمە لە سەر ئەو باوەڕەین کە تۆ مەدرەسەی بەرزی حیزب بخوێنی خـــۆت دەزانی هەموو کەس ناتوانێ بچێتە ئەو مەدرەسەیە •

کاك رەحمان گوتی منیش هەر لەسەر ئەو باوەڕەم •

ـ زۆر باشە ئێمە نامە بۆ کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆموونیستی چکوسلواکیـا دەنووسین •

دانیشتنەکە بە بێ باس و لێکۆڵینەوە لە بارەی ئێران و هاوکاری حیــزبی دیموکرات و حیزبی تودە کۆتایی پێ هات •

## چوونی ژیتنا

پاش ئەوە کە نیزیکەی دوو مانگ لە هوتێل بوم ، خێزانم لەبەر مندالەکە نەیدەتوانی بێتەوە هوتێل من بە تەنیا لە هوتێل مابوومەوە٠ مانەوەی من لە هوتێل بو ئەندامانی حیزبی تودە کە لە پراگ بوون و بەشی زوریان لە " ژیتنا " دەژیان ، ببوە هوی ئیرەیی و گلەیکی پیوە ماندو بوون ٠ زور جار بە نوێنەری حیزبیان گوتبوو : بوچی ئێمە لە ژیتنا دەژین و کەریم لە هوتێل رادەبوێرێ ؟

نا حەقیان نەبوو ، چونکە بێجگە لەو قسەو باسانەو شەرە دندووکە و ئیرەیی بە یەك بردن کاری دیکەیان نەبوو٠ نوێنەری حیزب ئەفسەرێکی ژاندارمەری حکومەتی ئێران بوو پیاوێکی زور باش و بەراستی کومونیستێکی واقعی بوو لە پراگ بە نێوی " دایی " دەناسرا٠ نێوانمان زور خوش بوو٠ روژێك پێی گوتم :

ــ برادەرانی چیك گوتوویانە هەتا خانووت دەدەنێ خێزانت دێتەوە لات توش بچی لە ژیتنا بژی ٠

ژیتنا شەقامێك بوو لە پراگ لە نیزیك مەیدانی " ڤاسلاڤسکی " ، خانووی ژمارە چوار ٠ نیزیکەی ٢٠٠ ژووری بچوکی ٢ کەسی هەبوو٠ لە سەر دەمی رێژیمی بورژوازیدا واتە پێش ئازادی چکوسلواکی هاتنە سەرکاری حیزبی کومونیست ئەم شوێنە ژنی خراپی تێدا ژیاون و فاحشە خانە بوە٠

پاش رووخانی رێژیمی سەرمایەداری ئەم ژنانەیان بو کارخانەو شوێنی کار کردن ناردوون و بلاوەیان پێ کردون خانوەکەش ببوە دەولەتی ٠

له پێشدا پەنابەرە سیاسیەکانی یۆنانیان لەم خانوە نیشتە جێ کردبوو.
دوایەش ئێرانیەکانیشیان بردبوە ئەو خانوەو لەوێدا دەژیان . دەرکەوانێکیان بۆ دانابوون ، هەر کەس پاش سەعات دوازدە چووباوە دەرگای لێ نەدەکردەوە.
کابرای دەرکەوان دەتگوت خانووی خۆیەتی و لێیان بڕیوە. هەمیشە روو گرژ تووڕەو تۆسن وەك سەگی دڕ وابوو.
جارێك (دایی) دەیگێڕاوە دەیگوت شەوێك کارم هەبوو ناچار بووم تا دوای سەعات دوازدە نەمتوانی بگەڕێمەوە بۆ خانوەکەم کە گەیشتمە بەر دەرکی نەم وێرا زەنگ لێ بدەم . دەمزانی کابرا وەك سەگ بە گژم دادێ . له پێشدا گوتم چار نیە، لە بن دەرگا خۆم مات دەکەم تا دەبێتە رۆژ. پاشان بیرم له شتێکی تر کردەوە . هەر لە پەنای دەرگای ژیتنە تەلیفۆنێك هەبوو . چووم تەلیفۆنم لە کابرا کرد . لە خەو راپەڕیو تەلیفۆنی هەڵگرت هەلۆی گوت و من تەلیفۆنەکەم داناو زەنگی دەرگام لێ دا. کابرا هات دەرگای کردەوە. گوتم ببەخشە کارم هەبوو وەدرەنگی کەوتووم .
کابرا گوتی : تو قەی ناکا سەگ بابێك تەلیفۆنی کردو لە خەوی راپەراندم نازانم ئەو سەگبابە کێ بوو.
ملم هیز کردوو دەنگم نەکردو چوومە ژووری .
بە کورتی منیشیان بردە ژیتناو ژوورێکیان دامێ . بەڵام زۆری پێ نەچوو له به شەقامی " مانیسیۆا " خانوویان دامێ و خێزانم لە گەڵ منداڵەکەی هاتەوە و جێ گیر بووین .

## بێ دیپلۆم بۆ زانستگا

لە بەرگی یەکەمی بیرەوەریەکانم دا باسی ئەوەم کردوە کە من نەچوومەمەدرەسەوە لە دەبیرستان نەم خوێندبوو دیپلۆم و بەلگەی خویندەواری مەدرەسەم نەبوو • ئەوەی دەمزانی هەمووی لە ( مەکتەبی خطك ) دا فێری ببوم ئەو چەند مانگەی لە پراگ بووم کاك رەحمانی قاسملۆ لە بارەی دەستوری زمانەوە گەلێکی یارمەتی دابووم ، لە باری زمانەوە فێری زۆر شتی کردبووم و تۆزێك لە دەستوری زمان حالی دەبووم • بەم حالەش دەبوایە لە تەمەنی سی و شەش سالیدا بچمە زانستگاو ببم بە خوێندکارو دەرس بخوێنم • ئاشکرایە لەو تەمەنەدا بۆ کەسێکی ریشەی خویندن و فێربوونی مەدرەسەی نەبووبێ زۆر دژوارە • لە زانستگاش لەم تەمەنەدا بە زەحمەت خوێندکار وەردەگرن بەلام من پەنابەری سیاسی بووم • بۆ وەرگرتن لە زانستگا داوای دیپلۆم و بەلگەی خوێندنیان لێ نەکردم • بە تایبەت حیزبی تودەی ئێرانیش ناساندبوومی •

بە کورتی لە زانستگای پراگ لە کۆرسی زمان ناوم نووسی و هەوەلی سپتامبری ۱۹٦۰ لە گەڵ خوێندکارانی بێگانە لە زانکۆی زمان دەستم کرد بە خوێندنی زمانی چیکی •

لە ژیانم دا کاتێك بریارم دابێ کارێکی بکەم هەمیشە بە شێل گیری بەوەی بەرزو بە بیرو باوەرەوە دەگژ راچووم و تەواوم کردوە • مەسەلەی خوێندنەکەشم ئاوا بوو • دیتم زمانەکە زۆر زەحمەتە زۆر کەمی تێ دەگەم و لە سەرەتاوە هەر تەقەم لە سەری دەهات • بەلام بریارم دابوو کە بخوێنم ئیتر شەو رۆژ خەریك دەبووم و نەم دەهێشت کاتم بە فیڕۆیی بچێ •

هەرچەند مرۆڤ لە تەمەنی هەورازیش دا بێ بەڵام دیسان خوێندکاری و خوێندن لە نێو خوێندکارانی گەنج بە تایبەت لە جێی وەك پراگ نەك هەر ناخۆش نیە بەڵکو مرۆڤ دەبووژێنێتەوە ٠

لەو کاتەدا ئیتر ماڵمان هەبوو خێزانم لە کرج گەڕابۆوە ، بەڵام ئەو مەعاشەی وەك خوێندکارێك وەرم دەگرت فرە کەم بوو بەشی ژیانی نەدەکردین خێزانم بڕیاری دا منداڵەکان لە یانەی مناڵان دابنێ و کار بکا ٠ لە کارخانە ـ یەکی رادیۆ سازی کاری دیتەوەو دەستی بە کار کرد ٠ مەعاشی هەر دووکمان بەشی دەکردین و وەزعی ژیان و بەڕێ چوونمان خراپ نەبوو ٠

پاش ئەوە کە چەند جاری دیکەش لە بارەی یارمەتی بەو برادەرانەی کە لە عێراق مابوونەوە لە بارەی هێنانی عەولای عیزەت پور و یوسفی ڕێزوانی و یوسفی ئەنوەری بۆ ئۆروپا نامەم بۆ ڕێبەرایەتی حیزبی تودە نووسی و جوابیان نەدامەوە ، ئیتر وازم هێنا بەڵام قەتیش ئەوانم لە بیر نەچۆوە ٠ سەرگەردانی و پرش و بڵاوی ئەو کوڕە باشانە لەگەڵ بەشخوراوی نەتەوەکەم، هەمیشە فیکرو هۆشی ئازار داوم ٠

## کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئۆروپا

لە مانگی ئوتی ١٩٦٠ کۆمەڵەی خویندکارانی کورد لە ئۆروپا لێی گێڕاینەوە کە لە پێنجەمین کۆنگرەی خوێندکارانی کورد لە ئوروپا دا بەشدار بین. کۆنگرە لە برلینی روژئاوا دەگیرا لە گەڵ کاك رەحمانی قاسملۆ چووینە برلینی رۆژ هەلات . کاك رەحمان دەیویست چاوی بە رێبەرایەتی حیزبی تودە بکەوێ . لە قەرارێکی پێشو دایناو چاومان بە کیانوری و فروتن ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی تودە کەوت ، توزێك لە وەزعی ئێران پرسیاریان لە من کرد پاشان گوتم :

ـ هاورێ کیانوری ئێوە بۆ چی ولات و بەجێ هێشتوە ناگەرێنەوە بۆ ئێران و تین و تاوێك وەبەر خەبات بدەن و رێکخراوەکانی حیزبی تودە زیندو بکەنەوە؟

ـ چۆن بگەرێینەوە ؟ وەزعی ئێران ئێستا بۆیە نابێ ، پاشان رێگای گەرانەوە نیە ، بە کوێ دا بگەرێینەوە ؟

ـ ئەگەر بتانەوێ بگەرێنەوە رێگا پەیدا دەبێ . دەکرێ بە ئەفغانستاندا بچنەوە

ـ تۆ ریگای ئەفغانستان شارەزای ؟ شەش شەو و شەش رۆژ دەبێ بە پێیان بە رێگادا برۆی تا دەگەیە شارێکی ئێران .

ـ قەیدی چیە من چەند شەو و رۆژ بە پێ یان رۆیشتووم تا گەیشتوومە عێراق . پاشان ئەگەر ئێوە بوون بە ئەندامی حیزبی تودە قەراری ئەوەتان کردبوو کە هەر لە ئالمان بن و بە سواری ماشێن بگەرێن ؟

رفیق کیانوری قسەکانی منی بە دڵ نەبوو . پاشان لە لای ئەندامانی دیکەی

کۆمیتەی ناوەندی گوتبوی : " حسامی پسر خوبی است ولی کمی از مرحلە پرت است " واتا " حیسامی کوڕێکی باشە بەلاَم گێرەی لە هەولێر دەگەڕێ " ۰

پاش دیتنی کیانوری و فرۆتن کە هەستم پێ کرد دیتنێکی زۆر دۆستانە نەبوو لە گەلّ کاک رەحمان چووینە برلینی رۆژ ئاوا ۰ کە چووینە ئەو شوێنەی لە پێشدا بۆ کونگرە دیاری کرابوو دیتمان کەسی لێ نیە ۰ ئادرێسێکی دیکەیان نووسیوەو بە دەرگایانەوە داوە ۰

ئێمە شارەزا نەبووین لە هەموو خراپتر مارکی ئالّمانی روژ ئاوامان پێ نەبوو کە سواری تاکسی بین و بچینە شوێنی کۆنگرە ۰

تووشی کابرایەکی بووین ، کاک رەحمان بە ئالّمانیەکی کە دەیزانی پرسیاری شوێنەکەی کرد ۰ کابرا ئادرێسەکەی پێ گوتین ، گوتی سواری "ئوبان" بن لە فلان ئێزگە وەرنە خوارێ ۰ کاک رەحمان گوتی پارەمان نیە بلیت بکڕین ۰ کابرا وەك پیاوان دەری هێنا بەشی بلیت پارەی داینی ۰ کاک رەحمانیش پاکەتە سیفارێکی روسی پێ بوو کە رەسمی " لایکا "ی لە سەر بوو ، ئەو سەگەی کە هەوەل جار لە یەکێتی سوڤیەتی ناردبوویان بۆ ئاسمان ۰ دای بە کابرای ئالمانی ۰ کابرا ئەوەندە شاد بوو دەتگوت سەگەکەی بە زیندویی دراوەتێ ۰ گوتم کاک رەحمان ئەو کابرایە زۆر پیاو بوو ، یا ئالمانی نەبوو یا کرێکارێکی زەحمەتکێش بوو !

شوێنی کۆنگرەمان دیتەوە نێزیکەی شێست کەس خوێندکارو نەخوێندکار بەشدار ببوون ۰

رۆژی ۲۲ی مانگی ئوتی ۱۹٦۰ کۆنگرەی پێنجەمی کۆمەلەی خوێندکارانی کورد لە ئوروپا بە رەسمی دەستی بە کار کرد لەو کۆنگرە دا دوکتۆر کامران بەدرخان لە پاریسەوە هاتبوو ۰ ئیحسان نوری پاشا لە تارانەوە هاتبوو ۰کاتێك ئیحسان نوری پاشا وە ژوور کەوت بە سرودی ئەی رەقیب پێشوازی لێکرا ۰ کاتێك کامران بدرخان هات کاك رەحمان گوتی ئێستا بە گڕم دا دێ بەلاَم باشە رەنگە نەم ناسێتەوە دەلێم من نەبووم کاکم بوو ۰

قسەی کاك رەحمان وەراست گەڕا ۰ کامران بەدرخان هات لە نێوانی

من و کاك رەحمان دانیشت  پاش ئەحوال پرسی و ناسینی قاسملۆ گوتی :
" ئەگەر تۆ کۆمەلەی خوێندکارانی کوردت تێك نەدابایە ، ئێستا وەزعی کۆمەلّە شتێکی تر دەبوو . ئێوە لە ئاست کۆمەلّەوە تاوانبارن " .
کاك رەحمان گوتی : " میرم ئەوە من نەبووم کاکم بوو ، ئەو دەم من لە ئۆروپا نەبووم " .
مەسەلە چ بوو ؟
سالی ۱۹٤۹ رەحمانی قاسملۆ ، ئەحمەدی قاسملۆ نورەدین زازا ، عیسمەت شەریف  و چەند کەسی دیکە کۆمەلەی خوێندکارانی کورد پێك دێنن کە ناوەندەکەی لە سویس بوە ، پاشان ئیرەجی ئەسکەندەری لە پاریس  بە رەحمان و ئەحمەدی قاسملۆ دەلّێ کە پێك هێنانی ئەو کۆمەلّەیە لە سەر بناخەی نەتەوەیی لە گەلّ " مارکسیزم " نایەتەوە . ئێوە دەبێ بچنە نێو یەکێتی خوێندکارانی ئێرانی کە سەر بە حیزبی تودە بوو . ئەوانی دیکەش هەرکەس لە گەلّ خوێندکارانی وڵاتی خۆیان هاوکاری بکەن. ئەو دەمە دەوڵەتی ئێران بورسی خوێندکاری رەحمانی قاسملۆی بریوە . حیزبی تودە هێناویەنە پراگ و لە چکوسلواکیا بورسی خوێندکاری بۆ وەرگرتوە . بەلاّم بەیاننامەی لەبەر بەك هەلوەشانەوەی کۆمەلّەی خوێندکارانی کوردیشی پێ بلاّو  کردۆتەوە .
بەم جۆرە پاش ئەوەی کە برایانی قاسملۆ  بەیاننامەی هەلّوەشانەوەی کۆمەلّەی خوێندکارانی کورد بلاّو دەکەنەوە ئیتر کۆمەلّە نامێنێ . تا سالّی ۱۹٥٦ جارێکی تر خوێندکارە نیشتمانپەروەرەکانی کورد لە لەندەن کۆمەلّەیان دامەزراندۆتەوە .
لە کۆنگرەی پێنجەم دا نوێنەری یەکێتی خوێندکارانی جیهانی ، یەکێتی لاوانی جیهانی ، نوێنەری پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق ،نوێنەری یەکێتی خوێندکاران و یەکێتی لاوانی عێراق بەشدار بوون. کۆمەلەیەکی کوردستانیش لە لایەن چەند کەسی هۆلّەندی یەوە دامەزرابوو نوێنەری ئەوانیش بەشدار بوو . لە راستیدا ئەگەر بە واقعتەماشا کرابایە ، لە جیاتی کۆمەلّەی خوێندکارانی کورد لە ئۆروپا دەبوایە بگوترێ : " کۆمەلەی خوێندکارانی

کوردستانی عیّراق ، سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عیّراق".
چوونکە دەبێ لە دوایەدا باسی دەکەین ، وە لە تەواوی کردەوەکان و سیاسەتی کۆمەڵەش لە سالآنی دوایی دا بە جوانی دەردەکەویّ کۆمەڵە هەمیشە سیاسەتی پارتی بەریّوەبردوە هەرگیز کوردستانی نەبوە.
دەستەی بەریّوەبەری کاروباری کۆنگرە هەڵبژیّردراو بە سرودی ئەی رەقیب دەستی بە کار کرد. پاش راپۆرتی سکریتر و وتاری نوێنەران هاتە سەر باسی بەرنامەی کومەڵەی خویّندکارانی کورد لە ئۆروپا .
دوو ریّباز ، دوو هەڵویّست لە کۆنگرەدا دەبینرا . یەکیان ریّبازو هەڵویّستی ئەم خوێنکارە کوردانە بوو کە ئەندامی حیزبی کۆموونیستی عیراق بوون و زۆر کەم هاتبوون. سیاسەتی حیزبی کۆموونیستی عیّراق لە بارەی بەشدار بوونی ئەندامە کوردەکانی لە کۆمەڵەو لە کۆنگرەدا روون نەبوو . لە پیّشدا نویّنەری حیزب لە ئۆروپا رایگەیاندبوو کە ئەندامەکانیان بەشداری نەکەن پاشان لیّکیان دابوّوە کە تەریك بوونیان لە کۆمەڵەی خویّندکارانی کورد دا کاریّکی راست نیە. لە عیّراقەوە خەبەریان دابوو کە بەشداری کۆنگرە بن . بەلآم ئیتر درەنگ ببوو لە ولآتەکانی ئۆروپای رۆژ هەلآت بیّجگە لە ئالّمانی دیموکراتی ئەوانی تر نەیانتوانی بوو بگەنە کۆنگرە .
زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵەی بەشدار لە کۆنگرەدا سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عیّراق بوون کە ریّبازو هەڵویّستیّکی جیاوازیان هەبوو. کۆمونیستەکان لە کەمایەتی دا بوون ، بەریّوەبەرانی کۆمەڵە کە دەیانزانی زۆربەی بەشدارانی کۆنگرە لەگەڵ ئەوانن، کەمتر ریّگایان دەدا کە لە سەر مەسەلەکان وتو ویّژ بکریّ . پتر لە سەر ئەوە سوور بوون کە دەنگ وەربگیریّ .
نموونەیەکی سەیر :
باسی ئەوە هاتە گۆریّ کە داخوا لە ئیّراندا بەختیاری کوردن یا کورد نین ؟ کەمال فوئاد و وریا رەواندزی و هیّندیّکی تر دەیان گوت بەختیاری کوردن. کاك رەحمانی قاسملوّ بە جوانی روونی کردەوە کە بەختیاری کورد نین، خۆشیان پیّ کورد نیە. ئەو باسە دریّژەی کیّشا ئاخرەکەی گوتیان دەبیّ دەنگ وەرگیرێ.

ئێمە گوتمان ئەوە شێوەیەکی راست نیە ، بە دەنگ دان کەس نابێتە کورد ٠ فایدەی نەبوو کورد بوونی عەشیرەتی بەختیاریان خستە دەنگەوە٠ بە زۆربەی دەنگ لە کۆنگرەی پێنجی خوێندکارانی کورد لە ئۆرووپا بەختیاری بوو بە کورد٠

هەر بەو بۆنەوە بەندی یازدەیان لە بڕیارەکانی کۆنگرەدا پەسەند کرد کە دەڵێ : " چوونکە کۆنگرەی خوێندکارانی کورد زۆربەی قسەو نووسراوەکانی وەك بەرنامەو بڕیارەکانیش بە عەرەبی بوون دەقی بەندی یازدە بە عەرەبی دەگێڕینەوە ٠

١١ـ يطالب المؤتمر الحكومة الايرانية ان تعترف رسميا " بان كردستان ايران اثنولوجيا و جغرافيا تضم من الجنوب الى الشمال المقاطعات والمنا- طق التالية " مقاطعة لورستان بما فيها بختيار ٠٠٠"

واتا : " کۆنگرە داوا لە حکومەتی ئێران دەکا بە چەشنی رەسمی دان بەوە دابنێ کە کوردستانی ئێران لە بارەی رەگەزی و جوغرافیایی لە خوارەوە هەتا سەرو ئەم ناوچەو هەرێمانە دەگرێتەوە : " هەرێمی لورستان بە بەختیاری یەوە "

کۆنگرە بڕیارێکی دیکەی پەسەند کرد کە داوا لە حکومەتی ئێران دەکرا کە لە کوردستانی ئێران قوتابخانەی کوردی بکاتەوە٠

عەولا خانی سەیفی قازی خوێندکارێکی کوردی ئێرانی هەستا و گوتی : " پێشنیار دەکەم کۆنگرە داوا لە حکومەتی ئێران بکا کە لە کوردستانی ئێران قوتابخانەی عەرەبی بکاتەوە، بۆ ئەوە کە خوێندکارەکوردەکانی ئێرانی فێری عەرەبی بن تا ئەگەر هاتنە کۆنگرەی کۆمەلەی خوێندکارانی کورد لە ئۆرووپا بتوانن لە قسەو ئاخافتن و بەرنامەو بڕیارەکانی کۆنگرە تێ بگەن !.

بەرنامەی کۆنگرە

لە سەر بەرنامەی کۆمەڵە باسێکی فرە توندو دوورو درێژ دەس پێ کرا٠ هەرچی ئێمەو برادەرانی حیزبی کۆموونیستی عێراق بووین لە سەر ئەو باوەرە بووین کە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد رێکخراوەیەکی دیموکراتی و پێشکەوتوخوازە پێویستە خەباتی دژی ئیمپریالیستی دژی ئیستعماری لە پرۆگرامی

کۆمەلە دا بکونجێندرێ ٠ ناکرێ رێکخراوەیەك خۆی بە دیموکرات _ پیشکەوتن-
خواز بزانێ ، بەلام لە پرۆگرامی خۆیدا باسی دژایەتی ئیستیعمارو
ئیمپریالیزم نەکا ٠

کەمال فوئاد و رێبەرانی دیکەی کۆمەلە کە سەر بە پارتی دیموکراتی
کوردستانی عێراق بوون دەیانگوت : " پێویستە نیە لە بەرنامەدا باسی
ئیستیعمارو ئیمپریالیزم بکەین ٠ بەتایبەت خوێندکارەکانمان لە ولاتانی
رۆژ ئاوا دەخوێنن و باسکردنی پێ ناوێ ٠ لە سەر ئەو مەسەلەیە کێشەیەکی
زۆر کرا ٠ من بە کەمال فوئادم گوت : " ئەگەر بەراستیشتان نەبێ وشەیەکی
دژی ئیستعماری هەر تێ بخەن٠ ئێستا تەنانەت ولاتەکانی ئیستعماریش جار و
بار دژی ئیستعمارو ئیمپریالیزم دەدوێن ٠

پاش ئەوە کە هیچ مەنتیق و بەلگەیەکیان بە دەستەوە نەبوو کە نیشانی
بدەن لە بەر چی نایانەوێ خەباتی دژی ئیمپریالیستی لە بەرنامەی کۆمەلە دا
بکونجێ گوتیان دەنگ وەر دەگرین٠
بە زۆربەی دەنگ " خەباتی دژی ئیمپریالیزم و ئیستعماریان لە بەرنامەی
کۆمەلە دەر هاوێشت ٠ هەرچەند بەندەکانی بنەرەتی پرۆگرامی کۆمەلە جوان و
پێشکەوتنخوازن ، بەلام باس نەکردنی خەباتی دژی ئیستعماری لە رێکخرا-
وەیەکی دیموکراتی خوێندکاری دا ، بەلای منەوە کەم و کوڕیەکی گەورە بوو ٠
لێرەدا بەرنامەی کۆمەلەی خوێندکارانی کورد لە ئوروپا کە لە کۆنگرەی
پێنجەم دا پەسەند کرا بە عەرەبی دەنووسینەوە :

دستور جمعية الطلبة الاكراد فی اوروپا

اولا" : الاسم : جمعية الطلبة لاكراد فی اروبا

ثانيا" : الاهداف الاساسيه :

١ـ توطيد الصلات بين الطلبة الاكراد فی اوروپا و تنظيم الالتقاءات الدوريه
بينهم ٠

٢ـ تحقيق التعاون المادی المتبادل بين الطلبة الاكراد فی اروپا ٠

٣ـ تنمية الثقافة الوطنية الكردية والعمل لصالح الشعب الكردی ومسألته
الوطنية ٠

٤ـ تعريف العالم على ثقافة الشعب الكردي و وطنه كردستان و اوضاعـــه و مسألته الوطنية ٠

٥ـ تقوية روح التعاون و الصداقة بين الطبة ا لاكراد و طلبة البدان ا لاخـــرى ، وا لاتصال بالمنظمات الطلابية و غير الطلابية من وطنية و عالمية والتعـــاون معها ضمن اهدافنا و مصالحنا المشتركة ٠

٦ـ تأييد نضال كافة الشعوب من اجل تحررها الوطني و تقرير مصيرهابنفسها بما فيها شعبنا الكردي ٠

لیرەشدا لەسەر نیوەرۆکی بەندی ٥ یش موناقەشە کرا ٠ ئیمە دەمانگوت پیوەندی بە ریکخراوەکانی خویندکاری پیویستە دیاری بکری٠ ریکخراوی خویندکاری ئەوتۆ هەن دروست کراون بۆ بەربەرەکانی هیزەپیشکەوتنخوازەکان لە جیهاندا ، پیوەندی گرتن لەگەڵ ئەوانە بە قازانجی جولانەوەی کورد نیە ٠ بەلام ئەوەشیان قبوڵ نەکرد و بە زۆربەی دەنگ سەپاندیان ٠

هەر لە کۆنگرەدا بە ئەندامی کۆمەڵە وەرگیرام پاشان لە پراگ بە ئەندامی بەریوەبەری کۆمیتەی لق هەلبژیردرام ٠

## چوونی زانستگا (مەدرەسەی بەرزی حیزب)

لە کورسی زمان باش دەچوومە پێش لە ئیمتیحان دا نمرەی باشم وەرگرت. لەو ماوەیەدا کە کورسی زمانمان دەخوێند دەیان بردین بۆ شوێنە مێژوویەکانی چکوسلواکیا ، دەیانگێڕاین ، جێگای مێژوویی و فەرهەنگیان پێ نیشان دەداین خوێندکاری بێگانە لە هەموو ولاتانەوە هەبوون سەفەرەکان خۆش دەگوزەران . لە وچانی هاوینیشدا خەریکی فێر بوونی زمان بووم . لە لقی کۆمەڵەشدا لە پراگ جارو بار کۆ دەبووینەوە و لە سەر زۆر مەسەلەکان ناکۆکیمان دەبوو. کوڕەکانی ئەندامی لق هەموویان سەر بە پارتی بوون بیرو باوەڕی تەسك و بێ تەجرووبەو تەنانەت هێندێکیان بێ بیرو باوەڕیش بوون . بەلام هەموویان لە سەر بەربەرەکانێ لەگەل حیزبی کۆمۆنیستی عێراق یەکیان دەگرتەوە.

ڕۆژی هەوەلی سپتامبری ١٩٦١ چوومە زانستگا و ئەمجارە بووم بە خوێندکارێکی رەسمی و بەرنامەی دەرس و دەفتەرچەی خوێندکاری کارتی چوونە زانستگام وەرگرت .

بەرنامەی دەرسەکانم بۆ سالی ٦١ ـ ٦٢ بریتی بوون لە :

١ـ مێژوی جولانەوەی کرێکارانی جیهان .

٢ـ پێوەندیەکانی نێو نەتەوایەتی .

٣ـ ئابووری سیاسی .

٤ـ ماتریالیزمی دیالیکتیك و ماتریالیزمی مێژوویی .

٥ـ سیاسەتی فەرهەنگی .

٦ـ میژووی حیزبی کۆمۆنیستی چکوسلواکی ٠
٧ـ زمانی چیکی ٠
دیاره ئەم دەرسانە بۆ کەسێکی رابوردوی خوێندنی مەدرەسەیی نەبێ هاسان نین ٠ بۆ ئەوەی بتوانم لە کاتی خۆیدا ئیمتیحانەکانم بدەم و وەدوا نەکەوم ، بریارم دا بە شێل گێری خەریك بم ٠
لە زانستگا لە گەڵ برادەرێکی چیك بە ناوی شتیپان کوبلیها " کە بەر- پرسی حیزبی پۆلی ئێمە بوو زووربێکیان دا بوومێ پێکەوە دەژیاین ٠ ئەو برادەرە گەلێکی یارمەتی دەدام ٠ زۆر کەم دەچوومەوە ماڵێ رۆژێ ١٢ ساعەت بەڵکو پتر خەریك دەبووم و دەم خوێندەوە وای لێ هات نەخۆش بووم دوکتۆر خوێندنەوەی زۆری لێ قەدەخە کردبووم ، داینابوو تەنیا رۆژی شەش ساعەت خەریکی دەرس و خوێندنەوە بم ٠ کوبلیها کتێبەکەی لێ وەردەگرتم و دەچووین بیرەمان دەخواردەوە ٠

## لە گەڵ بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد

لە هۆڵەندا کۆمەڵەیەك بە ناوی" کۆمەڵەی کوردستانی دوەلی " پێك هاتبوو بەڕێوەبەری کۆمەڵە ی خوێندکارانی کورد نووسراوەو چاپەمەنی ئەو کۆمەڵەیەی دەنا ردو دەینووسی بڵاوی بکەنەوە ۰

من لە کۆمیتەی لق دا پێشنیارم کرد نامەیەك بۆ کۆمیتەی بەڕێوەبەری بنووسین کە وەزعی ئەو کۆمەڵەی هولەندیمان لێ روون کاتەوە ۰ ئەم کۆمەڵە چیە ، سەری بە کوێوە بەندە و چۆن دامەزراوە ؟ نامەکە نووسرا بەڵام کۆمیتەی بەڕێوەبەری نەك هەر وەڵامی نەداوە ، بەڵکو لە پڕ رایگەیاند کە کۆنگرەی شەشی کۆمەڵە ئەم ساڵ لە هۆڵەندا لە ئامیستیردام دەبەسترێ۰

بێجگە لەوە،زۆر لە خوێندکارە کوردەکانی ئەندامی حیزبی کۆمۆونیستی عێراق لە پراگ داوایان کردبوو کە ببن بە ئەندامی کۆمەڵە ۰ کۆمیتەی لق وەری گرتبوون بەڵام بە گوێرەی بەندی چواری پرۆگرامی کۆمەڵە کە ئەویشیان بە زۆربەی دەنگ سەپاندبوو ، دەبوایە دەستەی بەڕێوەبەری گشتی لە سەر بڕیاری کۆمیتە لق لە بارەی وەرگرتنی ئەندام موافەقەت بکا ۰ دیارە ئەوەش هەر بۆیە بوو کە ئەندامەکان لە بێژنگ بدەن ۰ پاش دوو مانگ کە ئێمە نامەمان نووسیبوو جوابیان نەداوە ۰ کۆنگرەی شەش نێزیك دەبۆوەدیارە نەیاندەویست کە ئەندامانی حیزبی کۆمونیست لە کۆمەڵەدا وەربگیرێن و لە کۆمەڵە دا بەشدار ببن ۰

بۆ هەڵسەنگاندنی بڕیاری کۆمیتەی بەڕێوەبەری گشتی لە مەڕ بەستنی

کۆنگره له ئامیستیردام و و لام نەدانەوه له بارەی وەرگرتنی ئەندامی تازه رۆژی ١٩٦١/٥/٢٧ کۆمیتەی لق کۆ بۆوه . لەوێدا من پرسیم بۆچی کۆنگره جارێك له و لاتەکانی سۆسیالیستی نابەسترێ ؟

له و لام دا گوتیان بەرێوەبەری گشتی زۆری هەولّ داوه بەلام له و لاتانی سۆسیالیستی جێگاو رێگامان نادەنێ .

من دەمزانی وا نیه . له یەك دوو رێگاوه دەس بەکار بوون بۆ ئەوەی رێگا بدرێ کۆنگرەی شەشی کۆمەلّەی خوێندکارانی کورد له پراگ ببەسترێ پاش هەولّ و تەقەلایەك که برادەرانی حیزبی کۆمونیستی عێراقیش یارمەتیان دەدا ، بەکێتی خوێندکارانی جیهانی بەلّێنی دا که هەموو دەرەتانی بۆ بەستنی کۆنگره پێك بینێ . من بەگورجی نامەیەکم بۆ دوکتۆر وریا رەواندزی نووسی که وا هێندێ بەشی نامەکه لێرەدا دەگێرمەوه :

" برای خۆشەویستم کاك وریا پاش سلاوێکی گەرم چوونکه هەر ئادرێسی تۆم له لایه بیرو رای خۆمت بۆ دەنووسم و چاوەروان دەبم زوو ولامم بدەیەوه .

١- وەك دەزانین ( کۆمەلێکی کوردستانی دوو وەلی ) له هۆلەندا لەم ولاته خێر خوا و ئازادی بەخشه ! دامەزراوه . دامەزرێنەرانی ئەم کۆمەلّەیه هیچیان کورد نین . تەنیا له رێی خوادا بۆ ئازادی کورد تێ دەکۆشن ! زۆر باشه ... مالّیان ئاوا بێ . هەر له ئێستاوه بیرو رای خۆم له سەر ئەوان دەرنابرم .

هەر کەس بەراستی خزمەتی بزوتنەوەی کورد بکا ، پێشوازی لێ دەکەم . بەلام ئەوەش هەیه من وەك ئێوه هەرکەس ناوی کوردی هێنا فریوی ناخۆم . چوونکه نەتەوەی ئێمه زۆر جار دەستی بە ئاگر سووتاوه . ئێوه تائێستا لەسەر چۆنیەتی پێکهاتنی ئەم کۆمەلّەیه بەیانێکتان دەر نەکردوه ، بیرو رای خۆتان دەر نەبریوه ، هەر چوونکه ناوی کوردستان دێنێ ، دەلّێن گۆقارەکەیان بفرۆشن و بلاوی بکەنەوه . له کاتێکا دەبوایه ئەندامانی کۆمەلّه له پێکهاتنی ئەم کۆمەلّەیه ئاگادار بکەن . بێجگه لەوه مانگێك لەمەو بەر بۆ ئێوەمان نووسیوه بەلام و لامتان نەداوەتەوه .

٢- مەسەلەی جێگای کۆنگره که بریارتان داوه له ئامیستردام ببەسترێ بۆ

هەموو کەس بۆتە جێگای پرسیار . من بە سەربەستی بیرو ڕای خۆم لەو بارەوە بۆ ئێوە دەنووسم . چوونکە ناتوانم لە کۆنگرەدا بەشدار بم ، ئەگەر نامەکە توورەی کردن لە کۆنگرە بیخوێننەوە . نازانم بۆچی هەموو دنیا لە کۆنگرەی خوێنکارا-نی کورد وەتەنگ هاتوە بێجگە لە هۆڵەندا . ( پێتەختی ئەم دەوڵەتە کە بۆ ئازادی گەلان و نەمانی ئیستعمار تێ دەکۆشێ ! ) ئێوە باش دەزانن کە هوڵەند یەکێك لەم پێنج دەوڵەتانە بوو کە لە کۆڕی نەتەوەیەك گرتوەکان لە بارەی نەمانی ئیستعمار دەنگی موخالیفی دا . ئێستا ئەوە رازی بوە کۆنگرەی کۆمەڵەیەك لە وڵاتەکەی بگیرێ کە دەیەوێ مافی نەتەوەکەی لە تورکیاو ئێرانی هاوپێمانەکانی بستێنێ . بەڕاستی پیاو سەری لە کردەوەکانی ئێوە سووڕ دەمێنێ . ئێستا ئەو فیکرە بۆ من هاتۆتە پێش کە بە خۆرایی نەبوو ئێوە وشەی " دژی ئیستعمار " تان لە منهج و پروگرامی کۆمەڵەدا نەدەمەزراند چوونکە نەتاندەویست دەست لە وڵاتە ئیستعمارییەکان هەڵبگرن . بەو حاڵەش دەڵێن بەکێتی قوتابیانی عالەمی ئیعترافمان پێ ناکا . کاك وریا ... ئێوە لە پرۆگرامدا ناوی ئیستعمار ناهێنن بە کردەوەش خۆتان بەوانەوە چەسپاندوە بە هیوای ئەوەن لە سایەی وانەوە حەقی کورد بستێنن . من وا دەزانم ئێوە بۆ هەڵبژاردنی ئامیستیردام بۆ موئتەمەر دوو مەبەستتان هەیە . هەوەل ئەوەیە ناتانەوێ ڕەوشی خۆتان نیسبەت بە ئیستعمارو وڵاتەکانی ئیستعماری روو ن بکەنەوە . دووهەم ئەوەیە کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵە ناتوانن بۆ هوڵەند بێن. چوونکە هەم پارەی مەسرەفی هوڵەندە بە هەموو قوتابیەك نادرێت و هەم ئیمکانی پاس و ویزا بۆ هەمو قوتابیەکی کورد نیە . لەم دوو مەبەستە زیاتر چی دی تیا بەستە نیە .

کاك وریا بەڕاستی دەڵێم کە ئەم کردەوانەی ئێوە نەك هەر خزمەت بە ئامانجی کۆمەڵە ناکا بەڵکو زەربەی گران لە کۆمەڵە دەداو زیانی بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی هەیە . ئێوە ناتوانن هیچ قوتابیەکی تێ گەیشتووی کورد قانیع بکەن . لە کاتێکا نیوەی ئەندامانی کۆمەڵە لە شەرق دەخوێنن، تا ئێستا یەك کەرەت موئتەمەر لە وڵاتەکانی ئۆرووپای شەرقی نەگیراوە .

بەڵام لە هوڵەندا کە قوتابی کوردی لێ نیە ، موئتەمەر دەبەستن • جا لە سەر ئەم کردەوانەش بۆ فریوی قوتابیە سادەکان ئەڵێن یەکێتی قوتابیانی عالەمی یان یەکێتی گەنجانی عالەمی بە ئەنداممان قبوڵ ناکا • بەلام زۆر ئاشکرایە ئێوە ناتانەوی کۆمەڵەی ئێمە لەم رێکخراوە پێشکەوتوو دیموکراتیا ـ نەدا ببێت بە ئەندام • بە عەقیدەی من باشترە زۆتر بیرێك لە وەزع و حالی جیهان و وەزعی خەباتی نەتەوەکەمان بکەنەوە •

لە کۆبوونەوەی ١٩٦١/٥/٢٧ دا کاتێك کە لیژنەی لق لە سەر ئەم کردەوانەی ئێوە باسی دەکرد ، برادەرانی کە کوێر کوێرانە دیفاع لە ئێوە دەکەن وتیان زۆریان هەوڵ داوە لە وڵاتەکانی ئۆروپای رۆژ هەڵات جێگایان بۆ موئتەمەر نادەنێ • ئەمە درۆیەکی شاخدارە • من جێ بە جێ لە سەر ئەم موضوعە ئیقدامم کرد • ئێستا من تعهد دەکەم ئێوە ئەگەر بتانەوێ لە پراگ ئەم ساڵ موئتەمەر بگرن ، هەموو جۆرە یارمەتی ئێوە دەدەن ، وەقاعە و جێگاو رێگاو ویزاو هەموو جۆرە کۆمەگێك و پێ دەکرێ • ئەم پارەی لە صندوقی کۆمەڵە لە هوڵەندا بۆ قاعەو پرۆ پاگاندەو شتی تر مەصرەفی دەکەن لە صندوقی کۆمەڵە دا ئەمێنێتەوە ، وە دیارە بەستنی موئتەمەر لە پراگ هەم بۆ وەزعی سیاسی کۆمەڵەو هەم ناسینی دوواڕۆژی یەکێتی قوتابیانی عالەمی تەئسیری گرینگی هەیە ، وە هەم برادەرانی کە بۆ موئتەمەر دێن مەصرەفیان بە نیوە دەبێ • ئیتر بۆ ئەم پێشنیارەی من کە بەراستی ئامادەم هەموو ئەرکێکی موئتەمەر لە پراگ وە ئەستۆی خۆم بگرم هیچ بیانووتان نامێنێ وە بەیانی ناتوانن بە قوتابیان بڵێن کە جێگای ترمان نەبوو • هیوام وایە بە زویی لەبەر خاتری قازانجی کۆمەڵە قەراری پێشوو هەڵوەشێننەوەو ئێمە ئاگادار بکەن تا بۆ تەحضیراتی موئتەمەر ئیقدام بکەین •

٣ـ زیاتر لە دوو مانگان کە زۆر لە برادەران داوایان کردوە ببنە ئەندام• لیژنەی لق بڕیاری قبوڵی داون و بۆ ئێوە ناردراوە کە وەڵام بدەنەوە • بەڵام تا ئێستا وەلاموو نەداوەتەوەو ئەم برادەرانە لە وەزعی خۆیان حاڵی نین • نازانم کارو هێندە زۆرە کە ناتوانن وەڵام بدەنەوە یان ئەندامی تازەو گەرەك نیە •

باشتره ئەم نەقسەش لابەرن و بە زوويي وڵام بدەنەوە ·
چاوەنواری وڵامی گورج و فەوریم ·    برات کەریم

دەقی نامەکە دەری دەخا کە ئەو دەم لە ژێر تەفسیری کوردی نووسینی براکوردەکانی عێراق دا کوردی نووسینم تەواو تەزانیوەو لە باری رێزمان و رێنووس و وشەوە هەڵەی زۆر تیدایە ·
پاش ماوەیەك کاك وریا رەواندزی نامەیەکی تایبەتی بۆ نووسیبووم لە بارەی " کۆمەڵی کوردستانی دوەلی " وە نووسیبووی :
١- مەسەلەی جەمعیەتی کوردستانی دوەلی : لەو کەسانە پێك هاتوە کە ئێوە لە برلین چاوتان پێ کەوتن · بە گوێرەی بیرو باوەڕی ئێمە (بە تایبەت هی خۆم) ئەم کۆمەڵەیە زۆر دوورە لەو شتانەی کە باسی ئەکەی ، وە پێکهێنانی وە بوونی زۆر پێویستە · ئەو نشریەی دەری ئەخا شتی باشی تیایە ··· ئیستا مەسەلەی پارە مومکینە فیکری لێ بکەیەوە ، برام مانگێ ایمە (کۆمەڵە) چاردە دیناری ئەداتی ، وە نێزیکی ٢٨ دینار ماموّستا بەدرخان بۆی رەوان ئەکات·
ئەویش چەند ئەندامی خۆی هەیە ، بەم حاڵە کابرا ایشی خۆی ئەباتە رێگا ·
(لەم بابەتە زۆر حەز ئەکەم کە چەند تەعبیرێکی کە زۆر جار لە لایەن هەندێ کەس بە کار ئەهێندرێت لە جێگای خۆی بە کار بهێنرێت) ·
٢- لە بەر چەند سەبەبێك بە تایبەتی بۆ ئەوەی زۆر برادەران ئامادەی کۆنگرەی شەشەم بن ئەوە بریار درا کە لە ئاڵمانیا بگیرێت (وابزانم لە هانۆڤەر ئەگیرێت) چاوەڕی نامەی کاك کەمال ئەکەین : (دوای بەیان دەر ئەچێت)
٣- مەسەلەی هۆڵەندەو کۆنگرە گرتن ئەوە بوو چوونکە قەولێ وابوو جێگا بۆ نووستن ومقاعە گرتن سەهل و ئەرزانە · کاك کەریم ئەو خەیاڵەی کە ئەیکەی زۆر بێ جێگایە ! ئەو کوردەی کە دەست بۆ ئیستعمار درێژ ئەکات لە ناومان نیبە خۆت زۆر چاك ئەمە ئەزانی بەڵام چاوت دا ئەخەی لەم شتە ، کورد زۆر شتی لە ئیستعمار دیت ، بە چی رویەکەوە کورد دەست بۆ ئیستعمار درێژ ئەکات·
یەکی تر ئەم نامەیەی بنووسیایە ئەمزانی چۆن وڵامی بدەمەوە ·

بەلام ئەم نامە تایبەتییە کە بۆت ئەنووسم چوونکە ئەزانم کە ئینسانێکی باشی و بە هەڵە چوی ...
کاک وریا لە نامەکەیدا هێندێ شتی تری نووسیبوو کە بە پێویستی نازانم بیانگێڕمەوە . چوونکە دوکتۆر وریام بە ئینسانیکی باش و پاك دەزانی .
بە دوای نامەی کاك وریادا رۆژێك برادەرێکی ئەندامی کۆمیتەی لق نامەی دوکتۆر کەمال فوئادی دامێ ، نامەکە کرابۆوەو دیاربوو خوێندوویانەتەوە نامەکە زۆر دوورو درێژ بوو ، باسی ئەحمەد توفیقی کردبوو کە وەك حیزبی دیموکراتی کوردستان ئەوە لە کوردستان خەبات دەکا باسی ئەو نامەیەی خۆی کردبوو کە لە وەلامی رۆژنامەی کوردستانی تاران دا نووسیبووی لە نامەکەدا ئێمەشی بە کۆموونیست دانابوو نووسیبووی " ئێوە کۆموونیستەکان بێگانە پەرستن " نامەیەکی سەیر بوو دوکتۆر قاسملۆ نامەکەی لێ وەرگرتم بە داخەوە پاشان لێم وەرنەگرتەوە کە دەقەکەی لێرەدا بلاو بکەمەوە .
بەلام لە وەلامی دوکتۆر کەمال فوئاد دا نامەیەکی دوورو درێژم نووسیو بە سەر ئاوالەیی دام بە کاك عەولای ئەندامی کۆمیتەی لقی کۆمەلە لە پراگ کە بۆی بنێرێ .

لە نامەکە دا بۆ دوکتۆر کەمال فوئادم نووسیبوو : " سەری پاکەتەکەم نەبەستوە تا برادەرەکانت بیخوێننەوە . کاك کەمال ... کەسێك سکرتێری گشتی کۆمەلە بێ نامەی ئاوا بۆ ئەندامێکی کۆمەلە نانووسێ . بەلام وا دیارە کەسێکی لە سیاسەت دا ئەو بەر ئەم بەری کرد ، پاکی و ئەمانەتی قەلەمیشی نامینێ . کاتێکی لە دادگای نیزامی رێژیمی پەهلەوی دا مەحاکەمە دەکرام سەرهەنگی ئەرتەشی شاهنشاهی بە ناوی سەرهەنگ هادەوی کە سەرۆکی دادگا بوو پێی دەگوتم : " **تۆ بێگانە پەرەستی هەر بە تاوانی بێگانە پەرستی بە سێ ساڵ حەبس محکوم کرام** " . ئێستا تۆش کە سکرتێری گشتی کۆمەلەی پێم دەلێ : **بێگانە پەرست** . جا پێم نالێی لە گەل سەرهەنگی ئەرتەشی ئێران من چۆن فەرقتان بکەم ؟ کاك کەمال تۆ بە کۆموونیستەکان دەلێی بیگانە پەرست . بەلام تاقیکردنەوە نیشانی داوە کۆمونیستەکان لە گشت ولاتانی جیهان لە هەموو

له هه‌موو که‌س نیشتمانپه‌روه‌رترن • تۆ لات وایه کۆمونیسته‌کانی کورد له کانادا رژێمی سوسیالیستی داده‌مه‌زرێنن ؟ نا ••• ده‌یانه‌وێ هه‌ر له کوردستان دای بمه‌زرێنن • تۆ دۆستایه‌تی له گه‌ڵ یه‌کێتی سۆڤیێتی و ولاتانی سوسیالیستی به بێگانه په‌رستی داده‌نێی ، به‌لام من شانازی پێوه ده‌که‌م•••

نامه‌یه‌کی دوورو درێژ بوو پێویست ناکا هه‌مووی بنووسمه‌وه • ئیتر له کۆمه‌ڵه‌ی خوێندکارانی کورد دا به‌شدار نه‌بووم • چوونکه هه‌ر ئه‌و ده‌م تا ئێستا که ئه‌م یاداشتانه ده‌نووسم لام وابوو ، لام وایه که ئه‌وانه‌ی به ناوی کۆمه‌ڵه‌ی خوێندکارانی کورد له ئۆروپا کۆ بوونه‌وه وه ناوی کۆمه‌ڵه‌یان داناوه هه‌ر یه‌که سه‌ربه‌حیزبێکی کوردستانی عێراقن و نه‌یانتوانیوه کوردستانی بن• هه‌ر ده‌سته‌ی سیاسه‌تی حیزبه‌کانی سه‌ر به‌خۆیانیان به‌رێوه بردوه • نه‌یانتوانیوه خوێندکاره‌کانی کورد له هه‌موو به‌شه‌کانی کوردستان له کۆمه‌ڵێکی خوێندکاری دا کۆ بکه‌نه‌وه که دیموکرات و پێشکه‌وتنخوازو کوردستانی بێ ئامانجی له ئۆروپا خزمه‌ت به مه‌سه‌له‌ی کورد بێ به گشتی نه‌ك بۆ حیزبێك به تایبه‌تی •

له زانستگای حیزبی کۆمونیستی چکوسلواکی ده‌رسه‌کانم درێژه پێ ده‌دا له سایه‌ی تێکۆشانی شێل گیرو خوێندنه‌وه‌ی به‌رده‌وامم توانیم ئیمتحانه‌کان به بێ دوا که‌وتن له کاتی خۆیدا بده‌م• ساڵی دوایش وه‌پاش نه‌که‌وتم، له کاتێکا خوێندکاری دیکه‌ی بێگانه‌ش له‌و زانستگایه ده‌یانخوێند : ساڵێك وه‌دوا که‌وتن له ساڵی ئاخردا له سه‌ر " **هێندی به‌شی ئیسلاحاتی زه‌وی و زار له ئێراندا** دیپلۆمه‌م نووسی و به نمره‌ی به‌رز قبوڵ کرام " رۆژی ٢٩ی جوزه‌ردانی ١٩٦٤ ـ دیپلۆمی لیسانسم وه‌رگرت • له به‌ر ئه‌وه که له ده‌رس و ئیمتیحانه‌کانم دا سه‌رکه‌وتوو بووم• به‌رێوه‌به‌ری زانستگا پێشنیاریان کرد که درێژه به خوێندن بده‌م و دوکتۆرا وه‌ر بگرم • بریارم دا که به بێ پسانه‌وه خه‌ریکی ده‌وره‌ی دوکتۆرا بم •

به‌لام له‌م به‌ینه‌دا هێندێ رووداوی دی هاتنه پێش که په‌کی درێژه پێدانی خوێندنیان خستم • کاك عه‌لی گه‌لاوێژ که له رادیۆ په‌یکی ئێران کاری ده‌کرد ئه‌ندامی به‌رێوه‌به‌ری فیرقه‌ی دیموکراتی ئازربایجان بوو له باکۆ •

پێش یەك گرتنەوە، نێوانی فیرقەی دیموکرات و حیزبی تودە زۆر خـــۆش نەبوو. کاك عەلی گەلاوێژ لە کۆنفەرانسی فیرقە دا دژی ڕێبەرانی حیزبی تودە قسەی کردبوو. ئەوانیش لێیان وەدڵ گرتبوو. پاش یەکگرتنەوەی فیرقـــەو حیزبی تودە ئیرەجی ئەسکەندەری بیوە بەر پرسی تەبلیغاتی حیزبی، هـــەوەڵ کاری ئەوە بوو کە کاك عەلی گەلاوێژ لە رادیۆ دەر بکاو بینێرێتەوە باکـــۆ. رفیق ئیرەج دەیگوت لەبەر خاتری مەلا مستەفا ئەوەم کردوە، چوونکە مـــەلا مستەفا قینی لە عەلی گەلاوێژەو لە بەر دەنگی ئەو گوێ ناداتە رادیۆکەی ئێمە!

ئیرەجی ئەسکەندەری ڕۆژێك هاتە پراگ و گوتی : " پێشنیار دەکەم بچـــی لە رادیۆ پەیکی ئیران کار بکەی. ئەوە بە قازانجی جوولانەوەی کوردە.

ــ بە شەرتێك دەچم کە لە بارەی بڵاو کردنەوەی دەنگ و باسی کوردستـــان و وەزعی کورد و یادی ڕۆژە مێژوویەکان و یادی شەهیدانی کوردستان دەســەلات و سەربەخۆیي تەواوم هەبێ. دبارە وتارە ئەساسی و گشتیەکانی فارسی لە سەر وەزعی سیاسی ئێران و جیهان و دژی ڕێژیمی شاو بەشی ئێدەئولۆژی بە کوردی بڵاو دەکەینەوە.

ــ بەڵێ بەڵێ ... هەر دەبێ وا بێ ئێمە قەت پێشی بڵاو کردنەوەی دەنـــگ و باس و مەسەلەی کوردستانمان نەگرتوە ئەوان خۆیان خۆ بەکوردەوە مانـــدوو ناکەن. گەلاوێژ هیچ ئاگای لە کوردستان نیە ئیختیاری تەواوت دەبێ رەفیـق قزڵجی نەخۆشەو بە تەنیایە هەر لە بەر خاتری ئەو ئەم کارە قبوڵ بکەی.

ــ ئیستا ناتوانم بڕیار بدەم، پاشان وڵامتان دەدەمەوە.

لەو بارەوە لە گەڵ دوکتۆر قاسملۆ تەکبیرم کرد. گوتی لام وایە ئەگـــەر بچی کارێکی باشە، گەلاوێژ و کاك حەسەن هیچ باسی کورد ناکەن ئەگەر تۆ بچی لانی کەم دەتوانی لە سەر وەزعی کوردستان زۆر شت بنووسی لە ســەر ڕۆژە مێژوویەکانی کورد وتار بڵاو بکەیەوە.

هەرچەندە لە پراگ وەزعی ژیانمان تەواو ڕێك و پێك ببوو لەگەڵ ژیانـــی پراگ رێك کەوتبووین، کەمالی کوڕم ساڵی هەوەڵ دەچووە قوتابخانە لـــە زمانی چیکی سەر راست ببوین سەبارەت بەوە کە بتوانم لە دوورەوەش بـــێ،

خزمەتێك بە ئەدەب و زمانی گەلەکەم بکەم ، هێندێ لە مێژوی خەباتی نەتەوە-
کەم وەبیر خەڵك بێنمەوە ، لە باری سیاسەتی جیهانی و باری ڕێبازی خەبات
میللەتەکەم شارەزا بکەم ، بڕیارم دا کە نامە بۆ حیزبی تودە بنووسم و ئامادە-
یی خۆم بۆ کار لە رادیۆ پێکی ئێران رابگەیەنم ۰

لە پێش ئەوەدا بێمە سەر باسی سەفەر بۆ رادیۆی پێکی ئێران و بەو
سەفەرەش بەرگی دووهەمی بیرەوەریەکانم کۆتایی پێ بێنم بە پێویستی دەزانم
هێندێك رووداو و قسەو باسی ئەو چەند ساڵەی لە پراگ بووم بیانگێڕمەوە ۰

"هێندی ڕووداو و قسه و باسی پـــــراگ "

سالی ١٩٦١ له کوردستانی عیراق له نێوان گەلی کوردو حکومەتـــــی عیراق شەر دەست پێکرا ٠ هەوڵێن ئەنجامی ئەو شەرە کودەتای فەورییـــــه ی بەعسیەکان بوو کە حەمامی خوێنیان لە عیراق بەرپا کرد٠

کەماڵی کورم منداڵێکی چوار ساڵە بوو٠ منداڵیکی ژیرو وریاو قسه خوش له ژوورەکەی ئێمە وێنەیەکی پێشەواو یەکی لێنین هەلاوسرا بوون ٠ کەما ل هەموو ڕۆژێ دەی پرسی ئەوە کێیە؟ دەمانگوت هاورێ لینین ـ ە ٠ هەر لــــەو ساڵەدا هاورێ جەمال حەیدەری شەهید هاتە پراگ کە بۆ بەغدا دەگەراوە٠ هەر ئەو سەفەرە بوو کە چۆوە عیراق و بە دەستی فاشیستەکان شەهید کرا ٠ هـــاورێ جەمال ئەو شانازییەی دا بە ئێمە ڕۆژێك هاتە ماڵێ و پێکەوە نانمان خـوارد کە وەژور کەوت هێشتا هەر بە پێوە قسەمان دەکرد ٠ کەمال هاتە ژورێ و پرسی

" بابە ئەوە کێ یە ؟

ــ هاورێ یەکی خۆماتە ٠

تەماشای کر دو گوتی : بە زمانی چەکی " تۆنێنی ژاد نی سودروە ، تادی یێ سودروە لینین " واتا : ئەوە هاورێ نیە ئەوەتا هاورێ لینین ٠

شەهید جەمال لە ئامێزی گرتوو ماچی کردو گوتی : " باوکم ڕاست دەکەی هەر ئەو هاورێ یە "٠ هاورێ جەمال سەفەری کردو بە داخەوە نەمدیتەوە٠

منیش کـــــــوردم

شەر لە کوردستان گەرم ببوو هێزەکانی کورد سەرکەوتنیان ومدەســـــــت

دەهێنا • رۆژنامەکانی ئێران کە تازە خەریك بوون دەست بخەنە نێو شورشی کورد، دەنگ و باسی شەریان بلاو دەکردەوە • هەواڵدەری وەرزشی رۆژنامەی کەیهان ، کابرایەکی فارسی تارانی هاتبوە پراك • هاتو چۆی ماڵی خزمێکی دەکرد کە ئەفسەرێکی ئەندامی حیزبی تودەو دراوسێ ئێمە بوو •

رۆژێکیان دا نیشتبوین کابرای فارس گوتی : " ئاغای حیسامی منیش کوردم • باوەر ناکەی ؟ بەراستی کوردم "

ــ تۆ فارسی و خەلکی تارانی کەی بویە کورد ؟

ــ نا،با پێت بلێم ، پورم ژنی گۆرانەکانی کرمانشانە !

گوتم قەی ناکا ، ئەگەر جولانەوەی کورد برێکی تر سەر دەکەوێ ، زۆر کەسی وەك تۆ دەبنە کورد •

ئەو کاتەی لە زانستگا بوم هەمیشە فیکری ولات و وەزعی کوردستان ئازاری دەدام • گوێم دەدا رادیو پەیکی ئێران کە لە لایەن حیزبی تودەوە بلاو دەکرایەوە • کاك حەسەنی قزلجی و کاك عەلی گەلاویژ لە بەشی کوردی رادیوکە کاریان دەکرد• هیچ شتێکیان لە سەر کوردو مەسەلەی کورد بلاو نەدەکردەوە • یەك دوو جار نامەم بۆ کاك حەسەنی قزلجی نووسی و داوام لێ کرد کە لە سەر وەزعی کوردستان ، بێ بەشی خەلك زوڵم و زۆری ژاندارمەو سیاسەتی دەولەت بەرامبەر بە گەلی کورد وتار بلاو بکاتەوە• کاك حەسەن لە وڵام دا بۆی نووسیبوم : " ئێمە دەبێ وتارە فارسیەکان بکەین بە کوردی و بلاویان بکەینەوە حەقی هیچی دیکەمان نیە " •

ناچار نامەیەکم بۆ بۆرۆی سیاسی حیزبی تودە نووسی، لە بلاو نەکردنەوەی دەنگ و باسی کوردستان و وتار لە بارەی وەزعی کوردو یادی رۆژە مێژووییەکانی گەلی کورد، رەخنەم گرت • لە تاریخی ١٩٦١/٨/٢ ئیرەجی ئەسکەندەری بەرپرسی تەبلیغاتی حیزبی تودە بە ژمارەی ٣٩٢ نامەیەکی بۆ نووسیم کە وا دەقی نامەکە بە فارسی بلاو دەکەمەوە "

رفیق عزیز حسامی ، اگر چه جواب نامهء مورخ ١٩٦١/٦/١٦ شما بتاخیر افتاد ولی مضمون نامهء شما در موقع خود مورد مطالعه و بررسی لازم قرار

گرفته است • تذکر شما مبنی براینکه گفتارهای رادیوی ما به زبـــــان آزربایجانی و کردی باید مطالب اختصاصی به آزربایجان و کردستان داشتـه باشد تذکرکا ملا" صحیحی است • ولی اگر تاکنون نتوانسته‌ایم این نکتـه را در تبلیغات رادیوی خود مراعات کنیم بعلت آنست که اخبار خاص آزربایجان وکردستان باندازه کافی در دسترس ما نیست • هر وقت که این نقص مرتفع شود مسلما " تبلیغات ما نیز نقص کار خود را رفع خواهد کرد • از شما نیـز تقاضا داریم که هر وقت اخبار و اطلاعات خاص مناطق مذکور بدست آوردیـــد یا عین آنهارا برای ما بفرستید ویا مقالات در زمینه آنها برای گفتارهـای رادیو تهیه و ارسال دارید • موفقیت شما را خواهانیم •

ایرج اسکندری

له پراك كاك نوری شاویسی رەحمەتی وەك نوێنەری شورش هاتبوە ئوروپا وڕێگای کەوتبوە پراك• لەگەل كاك نوری هەمیشە نیوانم خوش بوو بە حـــەق جێگای ڕێزو ئیحترام بوو• ڕۆژیك هاتە ماڵێ و گەلێك قسەو باسمان کـــرد کاتیك دەرۆیشت گوتی :

ـ لەوانەیە بەیانی سەفەر بکەم• کارێك ، قسەیەك ، خزمەتێك ، ئامـــادەم ئەنجامی بدەم•

ـ گەلێك سپاس ، تەنیا تکایەکم هەیە لە گەڕانەوە دا لە جیاتی من سپاســی پارتی بکە کە لە عیراق دەریان کردم • چونکە ئەگەر ئەومیان نەکردبایـــە ، بێگومان منداڵەکانم لە برسان دەمردن •

کاك نوری گوتی : ئێمە لەگەڵ ئێوە خراپەمان کرد• پێم خۆشە لە بیرخۆتـــی بەریوە •

## نـامـە گـۆڕینـەوە لـەگـەل بـــــرادەران

لەو ماوەیەدا کە لە پراك بووم ، لەگەل دوکتور ڕەحیمی قازی لە باکـــو پێوەندیمان دامەزراند • گەلێك جار نامەمان بۆ یەکتر دەنووسی ، لە دوورەوە سەبارەت بە وەزعی کوردستان و بێ بەشی گەلی کورد دەردی دلمان دەکرد جـار جارە لە ڕێبەرایەتی حیزبی تودە و برێك هەورازتریش ڕەخنەمان دەگـــرت و

بۆڵەبۆڵیشمان دەکرد . نامەکانی دوکتور رەحیمی قازی یەکجار زۆرن و لە رادە بەدەر لە باری زمان و نێوەروك و دەستخەتەوە شیرین و جوان و پر مانان .
بەلام لەبەر ئەوە لە نامەکان دا مەسەلەی شەخسی و دوستایەتی و قسەی خۆمانەو سیاسی تێکەڵ کراون ، لە بڵاو کردنەوەیان خۆ دەبوێرم. هەر وەها نامەکانی کاك عەلی کەلاویژیش کە زۆر جوان و برایانەن بلاو ناکەمەوە هەر ئەوەندەی لێ زیاد دەکەم کە نووسراوەکانی کاك رەحیمی قازی و کاك عەلی کەلاویژ لەم دوور ولاتیەدا تا رادەیەکی زۆر تاسەیان دەشکاندم.
لە سەر مەسەلەی کوردو کەم و کوری لە سیاسەتی رێبەرانی حیزبی تودە را هەمیشە لە گەل بۆ رۆی سیاسی حیزبی تودە لە نامە نووسین دا بوم . خوا هەڵناگرێ ئەوانیش هەموو جاری ولامیان دەدامەوەو رەخنەکانیان دەسەلماند بەلام سیاسەتەکە قالیی گرتبوو نە دەگۆڕا .
لە ژێر تەئسیری راپەرینی گەلی کورد لە عیراق دا ، برادەرانی حیزبی تودەش هاتنە سەر ئەو باوەرە کە جم و جۆڵێك بکەن و رۆژنامەیەکی کوردي بلاو بکەنەوە . بۆ ئەو کارە دەبوایە لە دوکتور قاسملو و من کەلك وەرگرن. چەند جار ئەو باسە هاتە گۆرێ . ئێمە لامان وابوو رۆژنامەکە بە ناوی کوردستان دەربچێ ، ئەوان دەیان گوت " مەردوم بە کوردی بێ " . ئێمە دەمانگوت :
" بلاو کەرەوەي بیرو باوەری حیزبی دیموکراتی کوردستان بێ " ، ئەوان دەیانگوت : " ئێستا وەزعی حیزبی دیموکرات روون نیە . لە عیراق ئەحمەد توفیق بە ناوی حیزب دەدوێ" .
ئاخرەکەی هاتینە سەر ئەو باوەرە کە دوکتور رەحیمی قازی و کاك عەلی کەلاویژو دوکتور سولتانی وەتەمیشی بانگ بکرێن و کۆبونەوەیەکمان هەبێ و رێگایەکی راست بدۆزینەوە .
لە بەهاری سالی ١٩٦٣ برادەرانی حیزبی تودە کۆبونەوەیان لە پراك ساز کرد . بەلام تەنیا کاك عەلی کەلاویژیان هێنابوو . پاش دووروژ باس و لێکوڵینەوە هاتینە سەر ئەو بریارە کە رۆژنامەکە بە ناوی کوردستان لە لایەن " دەستەی نووسەرانەوە " بڵاو بکرێتەوە . بریار درا کە دوکتور قاسملو

سەر نووسەری رۆژنامەکە بێ • پاش ئەو بریارە کاک عەلی گەلاویژ کە بە هیوای سەرنووسەری هاتبوو، گوتی : من بەشداری ناکەم • باسێکی زۆرمان بوو ملی نەدا • پاشان چوینە ماڵی ئێمە باسەکەمان داگیرساندەوە، ئاخرەکەی کاک عەلی مان رازی کرد کە بەشداری بکا • بەلام هەر قسە بوو، کاک عەلی گەراوە ئێستاش هیچ بەشداریەکی لە دەرچونی رۆژنامەی کوردستان دا نەکرد •

سالی ١٩٦٣ کاک محەمەدی موهتەدی بۆ خویندن هاتبوە فەرانسە • لەوێ وە لە گەل دوکتور قاسملو پێوەندی گرتبوو • رۆژیک دوکتور قاسملو پرسی کەسیک بە ناوی محەمەدی " موعتەدی" دەناسی کە تازە لە ئیرانەوە هاتۆتە پاریس•

گوتم : ئەگەر " موعتەدی " بێ نایناسم ، بەلام رەنگە موهتەدی بێ و لەوانەیە کوری حاجی رەحمان ئاغای ئیلخانی زادە بێ •

لام وایە پایزی ١٩٦٣ بوو کاک محەمەدی موهتەدی هاتە پراگ • تازە لە ئیرانەوە هاتبوو ، بە قەولی کاک حەمەدەمینی سراجی " هەڵمی لێ هەڵدەستا " شورشگیرێکی توخ هەر ئاوری دێنا •

کاک محەمەد چەند رۆژیک لە پراگ مایەوەو پاشان گەرایەوە بۆ پاریس • دیتنی کاک محەمەد و پاشانیش نامە گۆرینەوەمان بەراستی شادی دەکردم• لە گەرانەوەدا هێندێک کتێبم دایە لەگەڵ خۆی بردن • لە پاریسەوە نامەیەکی بۆ نووسیبووم ، سەبارەت بە قسەی خۆش و شیرینی نامەکە ئەوا دەقی لێرە دا بلاو دەکەمەوە•

کاک محەمەد داوای لە دوکتور قاسملو کردبوو کە بۆی جێ بەجێ بکا بێ لە پراگ بخوێنێ • لە رادە بەدەر لە زەرق و بەرقی سەرمایەداری بێزار ببو • دەیگوت ، شاری پاریس زەلکاوی دنیای سەرمایەدارییە •

**دەقی نامەی کاک محەمەدی موهتەدی**

" برای گەورە و بەرێزم کاک کەریم • هیواداری سلامەتی و سەرکەوتنتانم • لە میوان داری و میهرەبانیتان زۆر مەمنونم خودا بتان پارێزێ بۆ یارمەتی - دانی هەموو برادەریکی کورد • هەرچەند ماوەیەکی کەم لە خزمەتتان دابووم ،

بەلاّم ئیرادەتم زۆر پەیدا کرد ٠ هەروەها سپاسیکی زۆر بۆ ئەو کتیبانەی دایتینی چۆنکە بەراستی کۆمەگێکی گرینگ بو ٠ کتیبەکان جێ زۆر سرنج و بەهرەن ، بەلام هەر بەو جورەی بۆ خۆتان فەرموتان پیاوی دەوێ تێ بگا و گەلکی لێ وەرگرێ ٠ بە بێ جێ نازانم ئەو نەقلەتان بۆ بگێرمەوە :
رەسول ئاغای وەرمەزیار هەبوو ، رەنگ بێ بیناسن ٠ بە رەحمەت بێ کابرایەك بوو قسە خۆش و مەجلیس خۆش ٠ نەقلٚ و نەزیلە و مەتەلۆکەی زۆر دەزانین و سەوادیکی میرزایانەی باشی هەبوو ٠ لەو ئاخری عومری دا کە چاوی نوری نەمابوو ، بۆ خوێندنەوەی شانامەو شتی وا توشی هەڵە دەهات ٠ عەینەکێکی بە هەزاردا و ناو وەدەست کەوتبوو ٠ جا دیارە لەو حاڵەدا عەینەکەی چەندە بەلاوە بەرێزو خۆشەویست بوە ٠ رۆژیك ئاغایەك لام وایە برایم ئاغای ئەمبار دەبێ ، بە میوانی دێو لە گەل ئەوەش هیچ سەوادی نابێ بە تۆپزی عەینەکەکە لە رەسول ئاغا دەستێنێ و لە گیرفانی دەنێ ٠ رەسول ئاغا زۆر پەشێو دەبێ ٠ پێ دەڵێن : رەسول ئاغا عەینەکێك ئەوەی ناوێ ، بنێرە لە تەوریز عەینەکێکی دیکەت بۆ بێنن ٠ رەسول ئاغا دەڵێ : برا من لەبەر ئەوە نارەحەت نیم عەینەکەکەم چوە ، بەلام ئەو کابرایە ئاخر هیچ سەوادی نیە ، مەگەر هەر پێ بترێ! هیوادارم ئێمە وامان لێ بەسەر نەیێ و بە باشی سرنجی بدەینێ و تێ ـ بگەین ٠ برات محەممەدی موهتەدی ٦٤/١/٢١

لە ماوەی شەر لە کوردستانی عیراق! بۆ وەرگرتنی خەبەرو ئاگاداری لە وەزعی شەر لەگەل گەلێك دوست و ناسیار پێوەندیم هەبوو ، نامەم دەگۆریەوە ١٩٦٣/٣/١٩ ئەفسەر دلسوز لە موسکو را نامەیەکی بۆ ناردبوم بەشە سیاسیەکەی ئاوا دەست پێ دەکا :
٠٠٠ مسا ڵەی عیراق : نازانم دێتە بیرت یان نا ؟ هاوین پێم گوتن کە امریکا خەریکی گورینی وضعی عیراقە ، ئەوەی کە ایستا کوردەکان دەیکەن بو مصلحەتی امریکایە !!
دێتە بیرت ؟

قوربان حزبی البعث لەگەل هەموو کۆنەپەرستەکانی عربی عراق بــــو روخاندنی عبدالکریم قاسم دەستیان خستوە دەست یك ئەمە لە لاییك ، لــــە لاییکی ترەوە پارتی کوردستانی عیراق سالیکو نیو خەریکی شەری لەشکــری عیراق بو بۆ روخاندنی قاسم هەموو جوورە کارێکی کرد٠ بەهەموو لاییـــك قاسمیان روخاند !! لەگەلّ روخاندنی قاسم شعاری لمناو بردنی کومونیستە - کانی عیراقیان هەلگرت ٠ هەر وا فعلا" بە هەمو هێزیکی خۆیان خەریکی لــــە ناو بردنی کومونیستەکانن ٠

ئەم کردەوەی پارتی چ سوودی میلەتی کوردی بو ؟ چەند خزمەتـــــــی امپریالیستی کرد ؟ ایّستا ئەمە ممکنە بزاندرێ !! نازانم کاکە انــــوەر ی ( مەبەستی دوکتور قاسملو)ە ٠ ایّستا دەلّی چی ؟ گویا مەلامصطفی اتفاقـــی لەگەل عبدالسلام عارف کردوە ٠ گویا عبدالسلام عارف هەمو حەقی کوردی دان پێ ناوە !! چەند راستی لە مە دا هەیە نازانم بەلام ئەوەی ممکنە پیش بینـــی لێ بکرێ ئەوەیە :

امریکا پاش ئەوەی عبدالکریمی لە ناو برد٬ مەیدان بو نوکەرەکانی خــــۆی پاك بووە مەلامصطفی ش لە ناو دەبا ٠ حکومەتی عبدالسلام ایستا هەر خەریکی هەلخەلەتاندنی کوردانە بو " کسب وقت " انجا هەر بە هۆی حکومەتەکانـــــی عبدالسلام و تورکیاو ایران و سوریا ملامصطفی لمناو دەبەن " ٠

کاك ئەنوەر دلسوز لەگەل ئەو نامەیە بە برادەریکی عەرەب دا دوو بوتلّـــی ڤوتکا بۆ ناردبووم بەلام برای عەرەب لە رێگا خواردبونیەوە و لە جیاتــــــی ڤوتکا " العفو " ی بۆ هێنابوم ٠

لەم بەینەدا لەگەلّ کاك حەسەنی قزلجی یادی هەر زیندو بێ نامەمــــــان دەگۆریەوە ٠ زۆر تامەزرۆی دەنگ و باسی وەزعی عیراق بوو ٠ هێندی خەبەرم بــۆ نووسی بون ، لە وەلام دا ئەم نامە شیرین و جوانەی بۆ ناردبوم ، بە یــــادی هەمیشەیی ئەو دەقیٰ نامەکەی لێرەدا بلاو دەکەمەوە :

" برای شیرینم کاك کەریم رۆژ باش / هیوادارم ساخ و سلامەت و بەکەیف بـــی ٠ لەکاری دیپلۆمەکەت دا زۆر زۆر موفق بیت زۆر سلاو لە براژنم دەکەم و چـاوی

برازاکانم ماچ دەکەم • نامە شیرینەکەت گەیشت و چاومی روون و دڵمی فێنك کردەوە • ماوەیەك بوو لەمەر نیشتمانە چارەرەشەکەمان دەنگ و باسێکی وا گیر نەدەکەوت دڵخوش کات و بێ دەنگە کرابوو بە ئەخباری کوشتاری گەلە مظلومەکەمان • جا سەبارەت بەمە ئەوشتانەی تۆ نووسیبوت زۆری دلنیا کردین • وە نامەکەت لە راستی دا وەکو خۆمان دەڵێن پێ و قەدەمی خێر بوو• رۆژێك دوای گەیشتنی ئەو وتاریکی زۆر دلسوزانە لە رۆژنامەی پراودا دا دەرچوو، سەر لە نوێ کونی دەنگ و باس و نووسینی جرايد لەمەر گەلەکەمان کراوە لەو گەلە کومەگی و عیل جاریەی کە هەموو سەگ و گورگی بەعس و استعمارو سەنتوی شاهەنشاهی گورسیل لە میللەتی کوردیان کردوە ، غەیری ئەم ولاتە انسان دوستانە پشت و پەنایەکمان نیە • وە لە حەقیقەت دا ئەم خەباتەی ئێستا لە کوردستان مفخرەی مێژووی خەباتەو هێجگار زۆر جێگەی ئومێدو هیوایە کە بە ئامانج بگات و بە سەگ و گورگی استعمارو ارتجاع حاڵی بکات کە کوردیش وەکو خەڵکی تر حەقی ژیانی هەیە • کاکە گیان ، تۆ لەو بەرەگەیە دای ، خەلك دەبینی و دەنگ و باست دەس دەکەوێ ، رەجا دەکەم لطفا " جارو بار کاغەزم بۆ بنوسەو چ دەبیسی بۆمان بنووسە با بزانین چ سەگ بە حەوشەیەك بەو بعثیە فاشیستیانە دەکەین ••• " •

ئەوەی کاك حەسەنی قزلجی لەو نامەیدا باسی دەکا کە •• وتاریکی زۆر دلسوزانە لە رۆژنامەی پراڤدا دەرچوە ، ئەوە بوو کە لە مانگی گەلاویژی ١٩٦٣ دا دەولەتەکانی ئەندامی پەیمانی سەنتو لە ئیزمیر کۆ بوونەوەو نەخشەی ئەومیان کێشا کە تورکیا و ئیرانیش دەست بخەنە نێو کارو باری کوردستانی عیراق• بە گوێرەی ئەم نەخشەیە کە بە "عەمەلیاتی دەجلە " ناو نرابوو، دەبوایە لەشکری تورك لە لای موسڵ و لەشکری ئیرانیش لە لای سولیمانیەوە بێنە کوردستان و راپەرینی کوردستانی عیراق سەرکوت کەن•

هەواڵدەری تاسی سوڤیتی بەیاننامەی رەسمی دەولەتی یەکیتی سوڤیتی بلاو کردبووەو رۆژنامەی پراڤداش چاپی کردبوو، وتاریشی لە سەر نووسیبو• لە بەیاننامەکەدا گوترابوو : " هەموو مروڤیکی شەریف و تەواوی ئەو کەسانەی

ڕێز لە مەبادی کۆڕی نەتەوە یەککگرتوەکان دەگرن ناتوانن لە ئاست سیاسەت و کردەوەی وەحشیانەی حکومەتی عیراق دژی گەلی کورد دەنگی ئیعترازو تورەیی خۆیان بەرز نەکەنەوە ٠ لە بەین بردنی کوردە بێ تاوانەکان و کوشتاری نیشتمانپەروەرانی عیراق تووڕەیی و بێ زاری گەلانی یەکیتی سوڤیتی توندو تیژ کردوە ٠ گەلانی سوڤیەت پشتیوانی تەواوی خۆیان لە خەباتی ڕەوای گەلی کورد لە عیراق بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی ڕادەگەینن "٠

٩ی مانگی گەلاویژی ١٩٦٣ ئاندرو گرومیکو وەزیری دەرەوەی یەکیتی سوڤیت لە بارەی کارەساتەکانی سەروی عیراقەوە بیرخەرەوەیەکی دا بە دەولەتەکانی عیراق و ئیران و تورکیا و سوریا ، ئەو حکومەتانەی وریا کردەوە کە :

" دەولەتی یەکیتی سوڤیەتی لە بەرامبەر دەست تێ وەردان لە گیرو گرفتەکانی نێو خۆی عیراق دا دەست لە سەر دەست دا ناتێ "٠

هەر لەم بوارەدا ولە باس و پێوەندی لە گەل مەسەلەی کوردستانی عیراق ، دوکتور ڕەحیمی قازی لە ١٩٦٢/٨/١٠ نامەیەکی بۆ نووسیم دەڵێ :

" کاکە ، لە چۆنایەتی نێو نەتەوەکانی ئەم ڕۆژ جیهان دا مەسەلەی کورد لە هەموو مەسەلەیەك تێکەڵ پێکەڵ ترو چەتون ترو ئاستەمترە ٠ جا لەبەر ئەمە مارکسیستەکانی کورد ( ئەمە قسەی تۆیە ) لە چونایەتیەکی زۆر سەخت و نالەباردا هەلکەوتوون ٠ لە سەر یەك بیرو ڕای من ئەوەیە کە لە حەلی ئێستادا چ لە ئیران و چ لە عیراق و تورکیە بزوتنەوەی گەلی کورد نابێ لە بزوتنەوەی گەلانی تری ئەم و لاتانە جیا بێت٠ هەم بە گوێرەی دروشمی و هەم بە گوێرەی سەروکایەتی کردنی ٠ بۆ ئەمەش بە بێ شك سیاسەت و تاکتیکی دروستی حیزبە مارکسیستەکان شەرتێکی بنچینەیی یە ٠ ( بە داخەوە جاری تا ئێستا حیزبەکەی خۆمان لەم ڕیگەیە زۆر دوورەو ناشیەوی خۆی نیزیك کاتەوە )٠

بەلام ئەگەر بە تایبەت عیراق لەبەر چاو بگرین پێویستە بلێم کە لە عیراق بزوتنەوەیەکی ئاوا لەمێژ بوو چاوەری ئەکرا ٠ ( ئامانجم پاش شورشی چواردەی تەموزە )٠ ئەگەر لە ڕۆژی یەکەمەوە بە گوێرەی تاکتیك و در وشمێکی دروست ئەم بزوتنەوەیە دەست پێ ئەکرا بێ شك تا ئێستا سەرکەوتنێکی بە

دیمەنی وەدەست ئەخست و ئەو هەموو خوێنەش نەدەرژا · جیا لەمە لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابوری عیراق دا گەلی کوردو کوردستان دەورێکی زۆر گرینگ و گەورەی هەیە · بۆ ئێمە مانان گەلێك جێگەی هومێدە کە حیزبی شیوعی عیراق لەمە گەیشتوە و لە سەر مەسەلەی کورد تاکتیکی دروستی لەبەر چاو گرتوە · بەلام بەداخەوە لەچەند بەلگەیەکی پارتی دا ئەبینم کە لەم حەلە عاستەمەدا پەلامار براوەتە سەر حیزبی شیوعی کە چی ئەمە هیچ بە سوودی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوایەتی گەلی کورد نیە · وەدەست هێنانی خودموختاری لە عیراق گرینگیەکی زۆر گەورەی ئەبێ بۆ هەموو بەشەکانی کوردستان و بۆ تەواوی نەتەوەی کورد ···"·

کاك عەلی گەلاویژیش هەر لەم بوارو باسەدا ۱۹۶۳/۹/۸ نامەیەکی بۆ ناردبووم ونووسیبوی : ( لیرەدا پیویستە بلیم لە باری رێنوس و رێزمانەوە دەستم لەم نامانە نەداوەو دەقەکەیان نووسراونەوە)·

" برای خۆشەویستم کاك کەریم گیان · لە هەستی برایەتی و دووستایەتی تو زۆر زۆر ممنون و متشکرم · برای بەریز ئەو انەی نووسیبوت هەمووی دروست بوو· درۆیان لەگەل کردین ، ویستیان بە فریومان بەرن ، بەلام ایمە فریومان نەخوارد بە قولی مشهور خودا لە سلطان محمود گەورەترە · هێوادارم خەباتی پیاوانەی ملتی کورد با لاخرە بەم بی خبرانە حالی بکات کە لە گوی گادا نوستن و چاو لە حقیقت نوقاندن ناتوانی صدمە بە کوردان بگەێنی ، بەلکو مالی ئەو کەسە وێران ئەکات کە چاوی نوقاندوەو گوی خوی آخنیوە·

ایمە کە دەلین گەلەکانی ئیران برای بیکن و طالعیان بە بیکەوە مربوطە لە روی دروزنی و ریاکاریەوە ئەم قسەیە نالین ، بەلکو بە سەر پایەی مسلك و عقیدەییك ئەم بیرە هاتوتە وجود · بەلام بعضە حرکات و رفتارو اطواریك ئەم بیکەتیە شل ئەکاتەوەو تاو و تەوژمی حرارتی بیکەتی گەلەکانی ایران سارد ئەکاتەوە کە البتە زور جیگای تاسف و داخە ·

کاتیك لە جیاتی نوینەرانی واقعی گەل چند کەسیکی لە گەل بی خەبەر خویان وەپیش خەن و بە نوینەری گەل دەست بۆ کردەوەی نادروست درێژ کەن،

خۆ بە خۆ گەلەکانی تر بۆ خاطری حق و عدالت مجبور ئەبن یا لە شوێــــن نوێنەرانی واقعی گەل بگەرێن و بیاندۆزنەوە ، یا ئەگەر ئەو کارەیان بـــو نەکرا حسابی خویان بە روشنی ببینن و بزانن لەگەل چ کەسانێک سەرو کاریان همیە • وضعی کوردستانەکە بەو جورەی تو نووسیوتە آزوقە کەمە،داو و دەرمان دەس ناکەوی ، مەزراو حاصلات و دیهات سوتاوەو صدهزار نفر دەربەدەر بون••"

لەو ماوەیەدا من ُدوکتور قاسملو زۆرمان هەول دەدا لە گەل ئەو براکوردانەی کە لە باکو و لە موسکو دەژین کۆ بینەوەو چاومان پێك بکەوی و بناخــــەی خەباتیکی راستەقینەی پیبشکەوتوخواز دوستی ولاتانی سوسیالیستی حیزبـی تودە دابمەزرینین • بەداخەوە ئەوەندە کۆبونەوەش کەوتبوە بەردەستـــــی ریبەرانی حیزبی تودە ، ئەوانیش نەیاندەویست کۆ بینەوە• بە جیا لەگـــەل یەکتر قسەیان لەگەل دەکردین • دوکتور قاسملو کە بەرەسمی ئەندامی حیزبی تودە بوو هەولی ئەوەشی دەدا کە لە ئوروپا شتیك بەناوی حیزبی دیموکــرات ساز بێ ، ئەو دەیویست هەم تودەیی بێ و هەم دێموکرات • دوکتور رەحیمـــی قازی و کاك عەلی گەلاویژ لە لایەك ئەندامی سەرکردایەتی فیرقـــــــەی ئازربایجان بوون ، لە لایەکی دیکەش بەناوی ئورگانی حیزبی دیموکراتــــی کوردستان لاپەرە رۆژنامەیەکیان بلاو دەکردەوە • کاتیك فیرقەی دیموکــرات و حیزبی تودە یەکتریان گرتەوە ، لاپەرە کوردیەکەیان داخست • ئەوانیـــش بایان داوە بۆ کوردایەتی •

دوکتور رەحیمی قازی ١٩٦٢/١٢/١٥ نامەیەکی بەم شیوەیەی بۆ نوویبوم:

" برای بەرزو بەرێزو خۆشەویستم کاك کەریم گیان : ئەو دوو مانگەی کــــە لە نەخوشخانە بووم ماوەی ئەمەم هەبوو کە برێك زۆرترو هێندیك قولتر لەمــەر کاروباری خۆمان و چارەنووسی گەلەکەمان لە چاخی ئیستادا بیر بکەمەوە• جا هاتمە سەر ئەمە کە بە تێکرایی نامەیەکی دوورو درێژو پوختەو هەمو لایەکـــی بۆ ناوەندی هینەکەی خۆمان ( مەبەستی حیزبی تودەیە ) بنووسین ، روویەکیشی بۆ ناوەندی گەورەکەی کە نێومان ناوە کعبەی خۆمان بنێرین • بە کورتی ناوە- روکی ئەم نامەیە بەم جورە ئەبێ : گرینگی چلۆنایەتی نیشتمانەکەمان لـــە

رووی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی‌یەوە لە زروفی ئەمرۆکەدا ، پێویست بوونی پەرەپێدانی ڕێکخراوەکانی سیاسی لەوێ بە شێوەیەکی تازە ، چۆنایەتی ئەمرۆکەی وە نەبوونی هیچ جورە هۆیەکی تەبلیغاتی لە لایەن خۆمان و ناوچەی سوسیالیزمەوە • پەرە سەندنی تەبلیغاتی هەموو لایەکی دوژمن بۆ هەڵە کردنی گەلەکەمان لە ڕێگەی خەباتی بەرێ و جێ سیاسەتی ناوەندی هینەکەی خۆمان لە سەر مەسەلەی کورد • کەم و کورتیەکانیان ، هەڵەو بەسەرچوونەکانیان ، دووانی یەك یەکی ئێمە مانان لەگەل سەروکەکان لەسەر ئەم مەبەستە ، ( چ ئێمە لێرەو چ ئێوە لەوێ ) • لە پاش پێك هاتنی یەکیتی وادەو گفت و دڵسوزیەکانیان لە قسە بەولاوە چ نەبوە ، تا ئێستا هیچیان نەکردوە پەیکی ئیران بە کوردی نەبوونی لەمە باشترە •

پێشنیارەکانی ئێمە ئەوانە دەبن : بەر لە هەموو شت کۆبوونەوەیەکی هەموو لایەکیمان بۆ پێك بێنن بە بەشدار بوونی هەیئەتی سەروکایەتی • هەڵمان بدەنێ بە کوردی بنووسین و چاپی بکەین و •••

جا براکەم ئەگەر بەمانە رازی ، خوا لێت بێ رازی ، ئیمزای خۆت بخە پال ئیمزاکەی قازی ، جا ئەو دەم با دوژمن هەر بێ نارازی • ئەگەر پێویستە شتیکی لەسەر زیاد بکرێ یا کەم بکرێ بینووسە • نووسراوەکە بە سێ زمانی کوردی و فارسی و رووسی ئەبێت ، پێویستە هەموومان ئیمزای بکەین • یانی ئێمەو ئێوەو هینەکانی پەیك • ئەوان رازین جا ئێستا ماوە رازی بوونی ئێوە ، دەنا هەموو شتێك حازرە • براکەم لەبەر ئەوەی کە ئەتۆو کاك رەحمان لەیەك جوێ ناکەمەوە ، ئیتر ناوەروکی ئەم نامەیە بۆ وی نانووسم • بە یەکەوە بیخوێننەوە و بە زووترین کات ولامم بۆ بنووسنەوە تا بۆتان بنێرم • "

پێشنیارەکانی دوکتور رەحیمی قازی لە لایەن ئێمەوە بێ ولام مانەوە • ئەوەندە کوردەی کوردستانی ئیران کە لە ئوروپا بووین هەروا لێك دوورو بێ بەرنامە رامان دەبوارد هیچمان لە سیاسەتی حیزبی تودە سەبارەت بە مەسەلەی کورد رازی نەبووین • حیزبی تودەش ئامانجی ئەوە بوو لە ڕێگای ئێمەوە حیزبی دیموکراتی کوردستان بکاتە لقی حیزبی تودەی ئیران ئەویش لەئوروپا •

ناخۆش نیە وتەیەکی دوکتور رادمەنیشی رەحمەتی سکرتیری حیزبی حیزبی تودەی ئیران بگێرمەوە: جارێك لەسەر مەسەلەی کورد باسێکمان هەبوو بیرو رامان لێك دوور بوو. لە ولامی قسەکانی من دا گوتی: " من پێم سەیرە، کومونیستەکانی کورد وا بیر ناکەنەوە "

پرسیم کێن ئەو کومونیستە کوردانەی کە وا بیر ناکەنەوە؟ دەرکەوت مەبەستی حەمەی حاجی سەعیدە، ئەو کوردە کومونیستەیان دۆزیبووە حیسابی کوردیان لەسەر قسەی ئەو دەکرد. ئەوە لە کاتێك دا کە دوکتور رادمەنیش بەراستی مروڤیکی راست و دلسوزو بروای بە مەسەلەی کوردو مافی دیاری کردنی چارەنووس هەبوو.

**دیسان کاك محەممەدی موهتەدی**

کاك محەممەد پاش ئەوەی لە فەرانسە زمانی خوێندبوو، نەیتوانی لەوێ درێژە بە خوێندن بدا. دەیویست بچێ لە ولاتە سوسیالیستەکان دەرس بخوێنێ.
دیارە لە سەفەری یەکەمدا بۆ پراك لەگەل دوکتور قاسملو باسی کردبوو. لە تاریخی ١٩٦٤/١٢/٣١ نامەیەکی بۆ ناردبووم ئەوەش دەقی نووسراوەکەیەتی:
" برای خۆشەویست کاك کەریم هەموو کاتیکتان خۆش. هیوادارم ساخ و بەکەیف بن. بەمینێکە نامەیەکم بۆ ناردون هەرچەند جوابم وەرنەگرتوە بەلام چونکە دەمەوێ بۆ کارێك یارمەتیتان لێ بخوازم، چێ دی راناوەستم و چاوەروانی ناکەم. جا ئەگەر وەختتان هەیە فەرموو گوێ راگرن با عەرزتان کەم:
ئەو وەختی هاتمە پراك لە بابەتی چوونم بۆ یەکیتی سوڤیەت پرسیارم کرت، کاك رەحمان ئاوای گوت: مەدارێك و داخوازی خۆت پێشکەشی سەفارەت بکە ئەوان جوابت دەدەنەوەو هیچ حەوجێ بە دەخالەت و یان یارمەتی نیە.
منیش چەندێك لەوەی پێش (تا ئێستا راوەستابووم بۆ ئەوەی دەوری کەلاسی زمانی فەرانسی تەواو بکەم و زەحمەتی هاتنە فەرانسەم بە خورایی نەچێ) چوومە سەفارەت و وابەستەی فەرهەنگی ـ م چاو پێ کەوت. دەگەلی دوام و مەسەلەی خۆم بۆ شەرح کرد، کورتەی قسەکانی ئەوە بوو: ئێمە نێوانمان لەگەل ئیران خۆشە!! هەر وەها ناوەندی زانیاریمان هەبە، ئەگەر دەتانەوێ بچن

سۆویەت وا باشە وە دەبێ لە پێشدا بچیە لای سەفارەتی ئیران وە ئەوان ناوی تۆ بدەن بە ئێمە !! من گوتم ئەوە قسەیەکی قۆڕەو ئەمن ناتوانم بچمە لای سەفارەتی ئیران و غەڵەتی وا بکەم . کاکی خۆم زۆرت سەر نەیشێنم قسەی ئاخری کابرا ئەوە بوو . ( هەر چۆنیك بێ ئێمە ناتوانین دەست بدەینە ئەو کارە ئەگەر دەتوانی بۆ خۆتان نامە بۆ یەکیتی لاوانی سۆویەت بنووسن و حالیان بکەن . رەنگە ئەوان یارمەتیتان بدەن) . ئادرەسی ئەو ریکخراوەی دامێ.

من لە نووسینی نامە دەستم راگرت، چوونکە پێم وا نەبوو نامەکەم جوابێکی بە کەلکی هەبێ . وام بە باش زانی ئێوە ئاگادار بکەم ( وا تێ نەگەن قسەکەی ئێوەم لە بیر کردوە کە دەتانگوت موسکو کاروانسەرا نیە) نازانم ئیمکان هەیە بۆ ئێوە لەو بابەتەوە یارمەتیم بدەن یان نا ؟ ئاشنایەك ، روشنا-یەك ، ناسیارێك نیە بتوانێ یاریدەمان بدا . خۆ ئەلعان ئێوە بۆ خۆتان لە نێو جەرگەی ئیشەکان دان ! تکا دەکەم لەو بابەتەوە ئاگادارم کەن.

دیارە ئەگەر ئیمکان هەبێ هەتا زووتر ئیشەکە جێ بەجێ بێ باشترە. چونکە وا ئێستا ئیشم لە پاریس تەواو بوە . چاوەروانی ساز بوونی سەفەرەکەم دەکەم. ئەگەر بەم بۆنەیەوە زەحمەتتان دەدەم تکایە ببورن . من خۆم هیچم نیە خودا جەزاتان بداتەوە .

خەبەریکی تازەم لە ولاتی نیە ، ئەوانێ هەلاتبونە عیراقی تاق تاق و جوت جوت خەریکن دەگەڕێنەوە. نێوان ناخۆشی ئەوانە لەگەل ئەحمەد توفیق و پشت-گرتنی ئەحمەد توفیق لە لایەن مەلا مستەفاوە دەلیلێکە لەسەر گەرانەوەیان.

لە پاریس ئەو بەیانەی دوکتور نورەدین زازا کە ناردیووی بۆ کومەلەی دەولەتانی بێ لایەن بلاو کراوە . نازانم دیوتانە یان نا ، دوو ریزی بە تەنی باسی ئیران دەکا لە شەش لاپەر ، بەلام دوکتور بەدرخان بەوەش نارازی بوو دەیگوت مانای چیە باسی ئیران بە خراپ دەکەن ! چاوەروانی و لامتانم.

برات محەمەد

کاتێك کە ئەو نامەیەم پێ گەیشت ئیتر لە پراك نەمابووم و چووبووم سوقیا . بەلام ئەوەی پێم کرا یارمەتیم دا کە کاك محەمەد بێ لە پراك بخوێنێ.

دوکتور قاسملو نامەیەکی بۆ نووسیم و گوتبوی: " ئێستا کە خەریك دەبین ڕۆژنامە دەربکەین ، باشترین ڕێگا ئەوەیە بە برادەرانی تودە بڵێن کاك محەمەدی موهتەدی بێننە پراك بخوێنێ ۰ هەم دەرسەکەی دەخوێنێ و هەم لە کاری ڕۆژنامەکەش یارمەتی من دەدا ۰ وا دیارە کوردیش باش دەزانێ ۰ من بۆ بوڕۆی سیاسی دەنووسم ، ئەگەر لە تۆیان پرسی تۆش بڵێ با کاك محەمەدی بێننە پراك "۰

بە دوای ئەودا رفیق کام بەخش نامەیەکی بۆ نووسیبووم دەڵێ : " رفیق قاسملو برادەریکی کوردی بە ناوی محەمەدی موهتەدی ناساندوە و داوا دەکا بیهێنین لە پراك دەرس بخوێنێ ۰ ئەگەر تۆ دەیناسی و پێشنیاری رفیق قاسملو تەئیید دەکەی ، ئێمە بۆ هێنانی ئەو هەنگاو ئەنێین ۰ "

لە وەلام دا نووسیمەوە : " کاك محەمەد دەناسم لاویکی رووناك بیرو کوردی زانەو زۆرم پێ باشە بێ لە پراك بخوێنێ "۰

پاشان کاك محەمەد لە سەر حیسابی حیزبی تودەی ئیران بورسی بۆ وەرگیراو هاتە پراك و دەستی کرد بە خوێندن و لە کارو باری ڕۆژنامەی کوردستان دا لە نووسین و لە ڕاپەڕاندن هاوکاری دەکرد۰ هەرچەند دوکتور قاسملو وەدوا کەوتنی چاپ و بلاو کردنەوەی ڕۆژنامەی بە سەر ئەو دادێناو دەیگوت تەنبەڵە ۰

## عوبەیدوڵلای بارزانی

هاوینی سالی ۱۹٦٣ ڕۆژێك لە پڕ دوکتور جەمیل شەرەف تەلیفونی بۆ کردم گوتی : " مەلا مستەفا هاتۆتە پراك ئەوە لە هوتیل ئەلکساندریایە"

واقم ور ما ، گوتم شتی وا نیە۰۰ درۆیە کێ وای گوتوە ؟

ــ درۆ نیە ، ئەوەی تەلیفونی بۆ کردووم خۆی دیتویەتی ، ئێستا ئەوە لە هوتیلە ۰

ــ باشە ۰۰۰ ئەوە دەچم بۆ هوتیل ، تەلیفونت بۆ دەکەمەوە ، ماڵی ئێمە لە هوتیل نزیك بوو کە چووم تەماشام کرد عوبەیدی کوری مەلا مستەفا لەگەڵ

کچیکی قژ زەردی چاوشینی جوان لە پیش باری ئارەق فروشی دانیشتـــــوەو بادەی لەبەر دەمە ٠ کە چاوی بە مز کەوت تاسیمی ٠ بە خیّرهاتنم کرد٠ گوتی " کاکە ئەگەر کارت بە منە دوای نیوەروّ وەرەوە"
ــ هیچ کارم بە توّ نیە ، بە منیان گوتبوو مەلامستەفا لیّرمیە٠ نەمزانـــــی توّی خەریکی خواردنەوەی ٠ ئیتر رانەوەستام و ومدەر کەوتم ٠
چەند روّژ پیّ چوو دوکتور جەمیل شەرەف هات ٠ گوتی : پیس قەوصـــــاوە، عوبەیدی مەلامستەفا لیّرمیە، لە باوکی زویر بوە ، چوّتە موسکو، لەویّ گیـــر نەبوە هاتوتە ئیّرە ٠ توشی قاحبەیەکی چەك بوە ، هەرچەندی بلـیّ ی جوان و لەبارە ٠ کچەتیو بردویەتە هوتیّلیکی دەرەوەی پراك ٠ پازدەروژ لەویّ رایگرتوە چوارهەزار دولاری پیّ بوە پیّ خەرج کردوە ٠ کە لەویّ پولّی نەماوە هیّناویەتەوە پراك ٠ لە هوتیلیّکی دیکە ژوری بوّ گرتوە ٠ یەك ساعات بەجیّ ناهیّلیّ ٠
منیان دیتەوە رادویەکم هەبوو لیّ وەرگرتوم داویە بە کچەکە ٠ هەزارو دووسەد کرونیشی پارە لیّ وەرگرتوم ٠ هیچی نیە ٠ چوم بە دوکتور قاسملوم گوتـــــوە چوّتە لای ، قەولی پیّ داوە کە بچیّ بە چیکەکان بلیّ، کوری بارزانی یـــــە میوانی بکەن و رای بگرن هەتا دەروا ٠ بەلام ئەوە چەند روژە خوّی لـــــیّ شاردوتەوە هیچ خەبەری نیە ٠
دوکتور قاسملو چوبوو بە ئیرەجی ئەسکەندەری گوتبوو کە کـــــوری مەلامستەفا لیّرمیە ، واباشە ئیّوە داوا لە برادەرانی چیك بکەن کە میوانداری بکەن و رای بگرن ٠ ئەو کارە پیّوەندی حیزبی تودە لەگەلّ مەلامستەفا بـــاش دەکا ٠ دیارە ئیرەج بەچاوانی پیّ گوتبوو بەلام خستبویە پشت گویّ٠
قاسملو ش کە هیچی بوّ نەکرابوو خوّی لە عوبید بواردبوو٠
بە جەمیل م گوت : من کارم پیّ نیە چومە لای بەخیرهاتنی بکەم لەبـــەر ئارەق خواردنەوە ئاگای لە هیچ نەبوو کەیفی خوّیەتی ٠
جەمیل روّیی ٠ پاش سیّ روژ تەلیفون زەنگی لیّدا ٠ کە هەلّم گرت عوبیدی بارزانی بوو :
ــ کاك سالح روژ باش ٠

ـ کێ یە قسە دەکا ٠
ـ عوبەیدم ، ئەبێ ببوری ئەوە دەمەوێ دێمە مالتان ٠
ـ فەرموو مالی خۆتە ٠
زۆر پێ نەچوو عوبەید لەگەڵ دوکتور جەمیل شەرەف هاتنە مالێ ٠ بەخێر- هاتنم کردن و عوبید گوتی :
ـ کاك سالح بەر لە هەموو شت برسیمە ٠٠٠ بروا بکە دوو روژە نانم نەخواردوە پارەم نەبوە٠
خیزانم کە گوێی لەم قسانە بوو گوتی : ئەی رۆ ٠٠٠ جا چۆن وا دەبێ ٠٠٠ ئەدی بۆ نەدەهاتی ئێرە ٠ بە هەلکەوت نان و چێشتیکی باشمان هەبوو نانمان خواردو عوبەید گوتی :
ـ کاك سالح پیسم لێ قەوماوە ٠ ئەوە بیست روژ پترە لێرە چاوە روانی تیلگرافیك بوم لە سویس راوە ٠ پێویستە بچمە سویس ، برادەریك چاوەروانم دەکات ٠ بەلام چۆن بچم ؟ پازدە روژ لە دەرەوەی پراك لە هوتیلێك بوم جانتا و لیباس و هەموو شتێکم لەو هوتێلە بەجێ ماوە ، ناتوانم بچم بیانهێنمەوە پارەی هوتێلم نیە پارەیەکی زۆریشە٠ هاتومەوە پراك ئەوە چەند شەوە لە هوتیلیك دەخەوم لەوێش هیچ پارەم نەداوە ٠ توشی قاحبەیەك بوم قەت نیو سەعات لێم خافل نیە ، ئێستا بە دزی هاتومە ئێرە٠ کاك ئەنوەریش (مەبەستی دوکتور قاسملو ـ ە ) خۆی لێ شاردومەوە ٠ بیتاقەی تەیارەم هەیە بەلام ناتوانم برۆم ٠
گوتم دەتەوێ بروێ بۆ سویس را ؟
ـ چۆن نامەوێ ، ئەوە دووجار برقیەیان بۆ لێداوم و چاوەروانیم دەکەن، بەلام چۆن برۆم ؟
گوتم جارێ ئەو کراسەت داکەنە با بۆت بشۆن کراسێك و لیباسم بۆ هێنا دەبەری کا ٠ پاشان گوتم تۆ لێرە بنو، من لەگەل جەمیل دەچم جانتاو شتەکانت بۆ دێنمەوە٠ مەیانبە بۆ هوتیل٠ جێگات بۆ رزیرڤ دەکەم، دەچین سواری فرۆکەت دەکەم و برۆ ٠

عوبید گوتی ئەگەر ئەوەی بکەی هەتا مردن لە بیرم ناچێ .
دوکتور جەمیل شەرەف ماشێنیکی هەبوو سوار بووین چووین بۆ هوتیلەکە لە دەرەوەی شاری پراك . بە خاوەن هوتیل ـ م گوت بۆ جانتاو شتوو مەکی عوبید هاتوم . (دیارە عوبید بە ناویکی ئەرمەنی وەك کریکاریکی کارخانەی باتا پاسپورتی وەرگرتبو) کابرای خاوەن هوتیل گوتی ئەو حیسابی نەداوە و رویشتوە .
من کارتی مەدرەسەی حیزبی کومونیستی چکوسلواکی م پێ بوو کە لەوی دەمخویند . گوتم لە هوتیلی حیزب میوانە ، ریزی حیسابەکە بدە بە من بۆت دەنیرین . کابرا دەستی کرد بە حیساب ، حیسابیکی چوارهەزار کرونی دا دەستم . کاغذم لی وەرگرت و جانتاو شتوومەکی عوبیدمان هەڵگرت و گەراینەوە . کە هاتینەوە پراك عوبید لە مالی ئیمە لێ نووستبوو . هەستا و کە چاوی بە جانتاکانی کەوت گەشکە بوو .
گوتم ئێستا کەی دەتەوێ سەفەر بکەی ؟
ـ هەر کاتی تەیارە هەبێ دەروم .
تەلیفونم کرد بۆ دەفتەری فروکەوانی چکوسلواکیا . گوتم بۆ بەیانی جیگا ـ یەك بۆ زوریخ رابگرن پاش سەعاتیك بلیتی دێنم . عوبید لە خۆشیان حەپەسا بوو . گوتی : باشە ئەم هوتیلەی ئێرە چ لێ بکەم چوار شەوە ژورێکی دوونەفە ـ ریمان گرتوە ، پارەشمان نەداوە .
گوتم بەیانی سەعاتی دە تەیارە دەروا . زوو هەستە کچەکە بنێرە دەروو خۆت لە هوتیل بە . من سەعاتی نۆ دێم بانگت دەکەم . سێ سەد کرونم دا بە عوبید گوتم : ئەم شوو قاحبەکەت سەرخۆش کەو باسی سەفەریش مەکە . جەمیل شەرەف گوتی : رادیوکەی من تێدا دەچێ ، قەی ناکا .
بلیتم لە عوبید وەرگرت و چوم جیگام بۆ سەعاتی دەی بەیانی ریزبرو کرد بە گوێرەی قەراری دامان نابوو عوبید بەیانی کچەتیو هەلدەستێنی دەلێ : تۆ بچو سەریکی مالێ بدەوە منیش لە هوتیل چاوەروان دەبم .
لەگەل دوکتور جەمیل شەرەف سەعاتی نۆ چوینە هوتیل جانتاو شتوومەکی

عوبید له مالی ئێمه خستبومانه ماشین و ئامادەی رۆیشتن بوین • چوومه ژوور عوبید چاوەروان بوو • به کابرای هوتیلم گوت ئەگەر کچەکه هاتەوه بلێ لێره چاوەروان بێ ، ئێمه سەعات دوازده دەگەرێینەوه• وەدەر کەوتین تەلیفون ـ مان کرد بۆ دوکتور قاسملو که ئەوه عوبید دەروا ، دەچین بۆ مەتار • ئێمه گەیشتینه فروکەخانه ، دوکتور قاسملوش هات • لەوێ نەیان دەهێشت ئێمه بچینه ژورێ و عوبید بەرێ کەین • ئەویش له ترسان پێی چەقاندبوو ، دەیگوت لەگەڵم نەیه ژورێ نارۆم • ناچار ئەوجاریش کارتی مەدرەسەم به کابرای پولیس نیشان داو گوتم میوانی ئێمەیه بەرێی دەکەین •

پۆلیس رێگای دا من لەگەڵ عوبید چومه ژورێ ، دوکتور قاسملو و جەمیل ـ یش له دەرەوه مانەوه • دانیشتین بیرەیەکمان خواردەوه ، عوبید سوار بوو له رۆیشتن دا گوتی : " ئەگەر پیاو بم له بیرم ناچێ "
عوبید فری و نەجاتی بوو ، نازانم کچەتیوی قاحبه لەگەڵ کابرای هوتیل چی یان کرد • دوکتور جەمیل شەرەف رادیویەك و هەزارو دووسەد کرۆنی چو• منیش دەمزانی عوبید ئەو پیاوه نیه چاکەی له بیر بمێنێ • چونکه تەجروبەم هەبوو•

بەرگی دووهەمی بیرەوەریەکانم لێرەدا کوتایی پێ دێنم به هیوای ئەوه که له بەرگی سێهەمدا خوێنەرانی بەریزی کورد له رووداوەکانی راپەرینی چەکدارانەی ١٩٤٧ و ٤٨ی کوردستانی ئێران و گەلێك رووداوی نێو جولانەوەی رزگاریخوازی کورد ئاگادار بکەم •

"کەریمی حیسامی"